# هەنار

84
ڕێبەندان ٢٧١٢
یەنایەر ٢٠١٣

گۆڤارێکی ئەدەبیی، هونەریی، ڕووناکبیریە







# هەنار


گۆڤارێکی ئەدەبیی، هونەریی، ڕووناکبیرییە
بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی
مانگانە دەریدەکات

**ژمارە ٨٤**
**ساڵی هەشتەم**
**ڕەشەمەندان ٢٧١٢ی کوردی**
**یەنایەر ٢٠١٣ی زاینی**

خاوەنی ئیمتیاز
بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی



سەرنووسەر
محەممەد کوردۆ
mhamadkurdo@yahoo.com

جێگری سەرنووسەر
محەممەد عەبدوڵڵا

بەڕێوەبەری هونەریی و نەخشەسازیی
پەیام ئەحمەد

**web:www.henar.org**

**Email:hanarkurd@gmail.com**
**Email:hanarkurd@yahoo.com**

ناونیشان: گردی ئەندازیاران
تەلەفۆن: ٣٣٠١٩٤٩

# پێڕست

## سەروتار



## یادی هەنار



## لێکۆڵینەوە



## دەق

## دیدار



---

## وەرگێڕان



---

## هونەر

سەروتار

# هەنار ماڵی هەموو ئەو کەسانەیە
# کە خەون بە دنیایەکی جوانترەوە دەبینن



محەمەد کوردۆ

لەگەڵ ئەم ژمارەیەدا گۆڤاری هەنار پێ دەنێتە ساڵی هەشتەمی تەمەنییەوە، بەر لە هەر شت پیرۆزبایی لە خۆمان و لە نووسەران و هونەرمەندان و روناکبیران و خوێنەران دەکەین و لە دڵەوە سوپاسی هەموو ئەو ئازیزانە دەکەین کە هەر یەکە بە شێوازی خۆی پشتیوانی لە بەردەوامبوونی ئەم گۆڤارە کردووە. هەنار گۆڤاری ئێمە نییە بە تەنها، گۆڤاری هەموو ئەو ئازیزانەیە کە بەبێ پشتیوانی و خۆشەویستی و هاوکاری بەردەوامی ئەوان، نەیدەتوانی و ناتوانێت بەردەوام بێت. گۆڤاری ئەو دەنگە نوێ و بە توانا و دەستڕەنگینانەیە کە پێویستیان بە گۆڤارێکی وەک هەنار هەیە بەرهەمە جوانەکانیان لە ناو ئەو فەوزا گەورەیەی ئەمڕۆی روناکبیری و رۆژنامەوانی کوردیدا، دەربهێنێت و بیانخاتە بەر دەستی خوێنەرە راستەقینەکان. راستە ئێمە شانازی بەوەوە دەکەین کە باشترین و دیارترین قەڵەمەکانی کورد، هەنار بە ماڵی خۆیان دەزانن و بە خۆشحاڵییەوە بەرهەمی تێدا بڵاو دەکەنەوە، بەڵام شانازی ئەوەشمان هەیە کە لەو ساڵانەی رابردوودا هەنار توانیویەتی مینبەرێکی باش بێت بۆ دەیان دەنگی نوێ، کە پێش ئێمە کەس دەرگای لە بەرهەمە جوانەکانیان نەکردۆتەوە. ئەو دەنگە نوێیە بەتوانایانەی ئێستای ناوەندی روناکبیری ئێمە، کەم نین، کە هەنار توناکانیانی کەشفکردووە و یەکەمین بەرهەمەکانیان لە هەناردا بڵاوکراونەتەوە. لە نێوەندی روناکبیریی ئێمەدا زۆرجار ترس و زۆرجاریش بڕوانەبوون بە دەنگی نوێ رێگرییان لە دەرکەوتنی وزەی گەورە کردووە، هەنار هەر لە سەرەتاوە

دۆزینەوە و ناساندنی دەنگی نوێی بە یەکێک لە ئامانجە سەرەکییەکانی خۆی زانیووە، چونکە بە بڕوای ئێمە تاکو ترس لە دەنگی نوێ هەبێت و بڕوا بە دەنگی نوێ نەهێنرێت، هیچ ئەدەب و روناکبیرییەک وەک ئەوەی پێویستە گەشە ناکات و گۆڕانکاری بە خۆیەوە نابینێت و ناتوانێت لەگەڵ رەوتی ژیاندا بەرەو پێشەوە بڕوات. ئێمە لەم یادەدا سوپاسی وەزیری رۆشنبیری و لاوان (د. کاوە مەحمود) و بەڕێوەبەری گشتیی پێشووی رۆژنامەنووسی و چاپ و بڵاوکردنەوە (شاکر ئەبوبەکر) و بەڕێوەبەری گشتیی ئێستای راگەیاندن و چاپ و بڵاوکردنەوە (هەڵگورد جندیانی) دەکەین، کە بێگومان بەبێ پشتیوانی ئەوان هەنار نەیدەتوانی و ناتوانێت درێژە بە ژیانی خۆی بدات. لەبیرمە لە یەکەمین دیداری من و وەزیری رۆشنبیری و لاواندا، کە ئەو کاتە تازە دەستبەکار ببوو، پێی وتم: (باسی هەناریان بۆ کردووم کە گۆڤارێکی باشە، من پشتیوانتان دەبم)، راستە پشتیوانیکردن لە بەردەوامبوونی هەنار تەرجەمەکردنێکی ئاشکرای ئەو بەڵێنە بوو کە بەڕێز وەزیری رۆشنبیری و لاوان بە ئێمەی دابوو، راستە ئەگەر پشتیوانی بەڕێزیان نەبوایە ئێستا هەنار نەمابوو، بەڵام ئێمە، بەتایبەت کە ئێستا بە رەسمیی سلێمانی کراوە بە پایتەختی روناکبیری کوردستان و هەناریش توانیویەتی زۆر بە روونی پێویستبوونی خۆی بسەلمێنێت، چاوەڕوانی هاوکاری و پشتیوانی زیاترین. من دیسان ئەو راستییە دەڵێمەوە کە: هەنار گۆڤاری ئێمە نییە بە تەنها، بەڵکو گۆڤاری هەموو ئەو کەسانەیە کە بەهای نووسین و داهێنان دەزانن و دەرک بە گرنگی لایەنە روحییەکانی مرۆڤ دەکەن و دەزانن زمان نیشتمانی راستەقینەی مرۆڤەکانە و هەناریش دەتوانێت خزمەتی ئەو زمانە بکات و شوێنێک بێت بۆ راگرتنی ئاستی بەرزی نووسین و رێگە بە دابەزینی ئەو ئاستە نەدات. هەنارماڵی هەموو ئەو کەسانەیە کە خەون بە دنیایەکی جوانترەوە دەبینن، ئێمەش وەک ستافی گۆڤارەکە ئەو شەرەفەمان پێ براوە ئەرک و ماندووبوونێکی زیاتر بخەینە سەر شانی خۆمان و زۆرتر و راستەوخۆتر لە هاوکارانمان، لەم ماڵە بچووک و سادە و خاکییەی هەناردا خزمەت پێشکەش بکەین. ئەمەش بۆ ئێمە شەرەفێکە بە هیچ پاداشت و دەستکەوتێکی مادی ناگۆڕینەوە. جارێکی دیکەش یادی هەنار لە هەمووان پیرۆز دەکەین و سوپاسی خۆمان بۆ هەموو ئەو ئازیزانە دووبارە دەکەینەوە کە هەر یەکە بە شێوازی خۆی پشتیوانی لە بەردەوامبوونی ئەم گۆڤارە کردووە. سوپاسیش بۆ هەموو ئەو ئازیزانەی لەم یادەدا سەرنج و تێبینی خۆیان خستە روو، بە دڵنیاییەوە سەرنج و تێبینییەکانیان بە هەند وەردەگرین.

## لە هەشتەمین سالیادی هەناردا

# راو بۆچوون و پێشنیازەکان

ئا: هەرێم عوسمان

گۆڤاری (هەنار) بەتەمەنێکی کەم و خزمەتێکی زۆرەوە پێدەنێتە (٨) ساڵی تەمەنییەوە، ئەم گۆڤارە لەهەوڵدابووە پێنووسە جیاجیاکان لەشوێنە جیاجیاکان و بەتەمەنە جیاجیاکانەوە بەشدار بکات لە خزمەتکردنی بەفەرهەنگ و ئەدەبیاتی کورد. ئەم گۆڤارە بەئارامی کاری خۆی کردووە، چەندین دەق و لێکۆڵینەوە و دیدارو بابەتی هونەریی و وەرگێرانی لە بوارە جیاجیاکاندا بڵاوکردۆتەوە، کە زۆر خوێنەر وەک ئەرشیف ئەم گۆڤارەی پاراستووە، چون بابەتەکانی نێو گۆڤارەکە هێندەی ئەوە بەکەڵکبوون کە ئەرشیفیان بکەن. لەلایەکی ترەوە ئەم گۆڤارەش بێ کەموکوڕی نییە، هەربۆیە ئێمە سەرنجی نووسەران و رۆشنبیران وەردەگرین لەسەری، تا باشتر بکرێت.

لەم تەوەرەدا هەوڵمانداوە چەندین بۆچوونی جیا وەک رەنگاورەنگی هەنار وەرگرین، چ گەنجان چ بەئەزموونەکان، چونکە (هەنار) خۆشی هەوڵیداوە بەمجۆرە بکات.

لێرەدا هەوڵدەدەین تا بکرێت، نامە و سەرنج و وتەکانی نووسەران و ئەدیبان وەک خۆیان بڵاوبکەینەوە.

ریزبەندی ناوەکان بە پێی ئەبجەدی دانراوە



## د. ئەحمەدی مەلا: ئەم گۆڤارە کاری پێشەنگی کردووە و کۆمەڵێ دەنگی نوێ و دەنگی دیکەش، پێکەوە خۆیانیان بە خوێنەر ناساندووە

گۆڤاری (هەنار)، لەو ماوەیەی کە خوێنەر پێی ئاشنابووە، وا خۆی لە دەیەیەک دەدا، ئەوەی بۆ روون کردینەوە کە کاری پێکەوەیی و کاری رۆشنبیریی مومکینە. لەم دە ساڵەی دوایی، سەرجەم ئەو دەروازانەی کە بە رووی ئازادیدا کرانەوە، بەر و بەرهەمەکانی لە نێو زمان و کاری ئەدەبی و خولقاندن و داهێنانەکانی دیدا رەنگیان داوەتەوە. لەم رووەوە، ئەم گۆڤارە کاری پێشەنگی کردووە و کۆمەڵێ دەنگی نوێ و دەنگی دیکەش، پێکەوە خۆیانیان بە خوێنەر ناساندووە. لە پاڵ دەقی نوێخواز، چەندین توێژەری ئەدەبی، بە چاوێکی دیکەوە هەڵسەنگاندنیان لەمەڕ ئەو بەرهەمە نوێیانە ئەنجام داوە و بوونەتە مایەی ئەوەی کە دەقی بەرهەمێنراو لە پاڵ رەخنەی ئەدەبی هاوتەریب لە کاردا بن.
ئەمە جگە لە چەند گۆشەیەکی دیکە کە بایەخی خۆیانیان هەیە و هەروەها کرانەوەش بۆ هونەری پلاستیکی خۆی لە خۆیدا، هاوچەرخێتی ئەو ئەکتەرانە ئاشکرا دەکات کە خۆیان بە دەرکردنی ئەم گۆڤارەوە خەریک کردووە. بۆیە بەردەوامی ئەم گۆڤارە هەبوونی دەروازەیەکە بۆ داهێنان و ئازادی گوزارشتکردن دەکات.

## ئارام کاکەی فەلاح: هەمیشە بە خۆشحاڵییەوە نووسینەکانم دەنێرم بۆ گۆڤاری هەنار

من هەمیشە بە خۆشحاڵییەوە نووسینەکانم دەنێرم بۆ گۆڤاری هەنار، خۆشم نازانم لەبەر گۆڤاری هەنارە یان دەستەی نووسەران و کاکە محەمەد کوردۆ، بەڵام قەت رۆژێک پەشیمان نەبووم لەوەی چیرۆکێکم لەوێ بڵاوبێتەوە چونکە دەبینم ئەو برادەرانە مانگانە و لەکاتی خۆیدا چاپی دەکەن و بڵاوی دەکەنەوە، بە خۆلێبووردنێکی زۆرەوە لەسەر نێت دایدەنێن تا خوێنەرێکی زۆر بیبینن و بیخوێننەوە، لەکاتێکدا دڵساردی خۆم لە هەندێ رۆژنامەو گۆڤاری تر پێشان دەدەم و حەز ناکەم چیرۆکەکانم بنێرم، بۆ هەندێ گۆڤار کە بەئارەزووی دڵی خۆیان وشەت بۆ دەگۆڕن و هەر یەکەیان جۆرێک لە شێواز و رێنووس رێنمایی دەکەن و هەندێ جار دەیدەنە دەست کەسانێک کە هەریەکەو خۆیت لێدەکا بە مامۆستای زمان، من هەنارم خۆشدەوێ، بەڵام ئەمەی دەیڵێم هیچ ریکلام کردن نییە بۆی، بەڵکو تا ئێستاش ئەم گۆڤارە ناتەواوی زۆرەو لە گەشەدایە، بەڵام نایشارمەوە کە گۆڤارێکە هەر سەیری پێرستەکەی بکەی دەزانی کە گۆڤارێکی رەنگاورەنگە، هەر لە لێکۆڵینەوەو دەق و دیدار و وەرگێران، تا بەشی هونەریی و پێشانگای کتێب لەخۆ دەگرێت کە وا دەکات خوێنەر بە زەوق و سەلیقەی خۆی، ئەوە بۆ خوێندنەوە هەڵبژێرێت کە حەزی پێ دەکات، ئەمە بێجگە لە چاپ و مونتاژێکی جوان و سەرنج راکێش، بەڵام بە تیراژێکی کەمی ٥٠٠ کە زۆر کەمەو پێویستە زیاتر بکرێت، هەروەها هەندێ جار دەقی زۆر لاواز لە لاپەڕەکانیدا دەبینرێت کە شایانی خوێندنەوە نییە، لەهەمان کاتدا دەقی زۆر جوانیش بڵاودەبێتەوە، بەڵام لەمانە جوانتر لای من ئاوڕدانەوەی گۆڤارەکەیە لە نووسەری گەنج و دەست گرتنیانە لەسەرەتای نووسینیاندا کە لای من زۆر گرنگ و پڕ بایەخە بە بێ منەت کردن بەسەر گەنجەکاندا بتوانی بەرهەمەکانیان بڵاوبکەیتەوە. لێرەوە رێزی زۆرم بۆ هەموو ئەو ئازیزانەی کە بەدەرکردنی گۆڤارەکەوە ماندوو دەبن.

یانوەری ٢٠١٣



## ئارام سدیق: پێویستە پاش ئەوەی سلێمانی وەکو پایتەختی ڕۆشنبیری ناسێنراوە ئامادەیی ئەم گۆڤارە زیاتر بکرێت

لە ڕاستیدا گۆڤاری هەنار لە چەند ئاستێکدا گرنگی هەیە، کە لەم خاڵانەدا خۆی دەبینێتەوە: یەکەم: گرنگیدانی بە ئەدەبیاتی لاوان.. هەرچەندە ئەمە لە ئاستی پێویستدا نییە، بەڵام پێویستە ئەو گرنگیپێدانە زیاتر بکرێت. دووەم: گرنگیدانی گۆڤارەکە بە بابەتی هەمەجۆر و تاڕادەیەک بەشێکی زۆری کایە ئەدەبی و هونەرییەکانی بەسەرکردۆتەوە، کە ئەمەش جێی دەستخۆشییە. سێیەم: دەرچوونی گۆڤارەکە بە بەردەوامی و بەشێوەیەکی مانگانە، کە ئەمە جێی دەستخۆشییە.

لاموایە دەبوو گۆڤاری هەنار زیاتر گرنگی بە خستنەڕووی کتێب و ناساندنی ئەو کتێبە نوێیە گرنگانە بدات کە بڵاودەبنەوەو هاوکات کردنەوەی مەلەفی جۆراوجۆر، لەسەر نووسەران و پرسە ئەدەبییە جۆراوجۆرەکان. لەم بوارەدا چەند هەوڵێک هەبوون، بەڵام کەمترن لە چاو ئامادەیی ئەم گۆڤارە لە ئێستای ئەدەبی کوردیدا. هاوکات یەکێکی تری لە گرفتەکانی ئەم گۆڤارە ئەوەیە، کە خۆی ساغ نەکردۆتەوە لەوەی گۆڤارێکی نوخبەوییە، یان گشتییە. چونکە پێیەکی لەنێو نوخبەدایە و پێیەکی تری لەنێو سادەکردنەوە و بەگشتیکردندایە. کە من لاموایە ئەم گۆڤارە زیاتر نوخبەوییە و پێویستی بەوە نییە (وتار و چاوپێکەوتنی) سادە و گشتی بڵاو بکاتەوە، واتە ئەو هێڵەی تا ئێستا کاری لەسەر کردووە، پێویستی بە پێداچوونەوە هەیە و دەکرێت لەمەولا زیاتر خۆی بۆ سازدانی چاوپێکەوتنی جیدی و بڵاوکردنەوەی وتاری جیدی ئامادە بکات. نەک چاوپێکەوتن بڵاوبکاتەوە کە کاری گۆڤارە گشتییە کۆمەڵایەتییەکان بێت.

بەگشتی ئامادەیی ئەم گۆڤارە پاش ئەوەی سلێمانی وەکو پایتەختی ڕۆشنبیری ناسێنراوە پێویستە زیاتر بکرێت.



## ئیسماعیل حەمەئەمین: گۆڤاری هەنار یەکێکە لەو گۆڤارانەی کەدەبێت وەزارەتی رۆشنبیری شانازیی پێوە بکات

گۆڤاری هەنار یەکێکە لەو گۆڤارانەی کە دەبێت وەزارەتی رۆشنبیری شانازی پێوە بکات، ستافێکی باش لەگەنجی پڕ گەرمی و جیدی لەمامەڵەکردنیاندا، لەگەڵ بڵاوکردنەوەی بابەتە ئەدەبیەکان، ئەم گۆڤارە ئێستا بۆتە نەریتێکی ئەدەبی لەنێوماندا و فراونکردنی کارەکانی بەڕای من ئەرکێکی دیکەی وەزارەتی رۆشنبیری دەبێت. ئەم گۆڤارە بەسەرەتایەکی زۆر جوان و هێمن دەستیپێکرد و ئێشتاش بەو هێمنیە کاردەکات، ئەمەش یەکێکە لە سیفەتە دیارەکانی گۆڤاری ئەدەبی، کە دەستەبژێری دەکات لەبابەت و بڵاوکردنەوەی کارە ئەدەبیەکانیدا، ناوە جیدیەکانی نیوەندی ئەدەبیمان کاری خۆیان لەم گۆڤارەدا بڵاو کردۆتەوە و بەمەش توانیویەتی پێگەیەک بۆ خۆی دەستبەر بکات، لەڕیزی گۆڤارە گرنگەکانی نێوەندی رۆشنبیریمانە. دەشێت تەنها یەک تێبینی بچوکم هەبێت لەسەر ئەم گۆڤارە، ئەویش لەمەڕ دیزاینی گۆڤارەکەیە، کە لەشێوەی کتێبدایە و گۆڤارە ئەدەبیەکان پڕن لەدیزاینی جوان، ئەمە جگە لەوەی تابلۆو کارەکانی هونەرمەندان، یان فۆتۆگرافان بڵاودەکرێنەوە بەکوالێتی بەرز، بەمانای گرنگیدان بەهونەری شێوەکاری و فۆتۆ نەک لەفۆرمی گۆڤاری شێوەکاری یان فۆتۆ، بەڵکو لەسەر ئاستی نیشاندانی چەند تابلۆیەک، یان فۆتۆت فۆتۆگرافەرێک، بەپابەندکردنی بەچرکە ئەدەبیەکانەوە، ئەمەش بەڕای من گۆڤارەکە زیاتر پێشدەخات. دیارە فراوانکردنی ئەم ستافە کە بەم ئەرکە هەڵسێت و تێچوونی گۆڤارەکە گرفتن لەبەردەم ئەم خەونەدا، هیوادارم وەزارەتی رۆشنبیری ئاوڕێک لەفراوانکردنی ئەم بوارە بداتەوە لەگۆڤارەکەدا... سڵاو لەهەنار، هەزار جار سڵاو..



## بەرزان هەستیار: تاکو ئێستاش بە خۆشحاڵییەوە زۆربەی شیعرەکانم لە «هەنار»دا بڵاو دەکەمەوە

بێ دوودڵیی هەر لە سەرەتاوە دەڵێم گۆڤاری «هەنار» یەکێکە لەو گۆڤارە دەگمەنانەی کە دەکرێت مانگانە چاوەڕێی دەرچوونی بکرێت و بابەتاکانی بخوێنرێنەوە، سەرەتای ئاشنابوونی من لەگەڵ ئەم گۆڤارەدا بۆ چەند ساڵێک لەمەوبەر دەگەڕێتەوە و پاش ئەوەی چەند ژمارەیەکم لێ بینی و بابەتەکانیم خوێندەوە هەستم کرد دەکرێت ئەم گۆڤارە بکەم بە یەکێک لەو ماڵانەی کە سەردان و هاموشۆیان پێویستە و ئیتر وەک ئاشنایەک ناو بەناو بەرهەمی شیعریی تازەی خۆمم بۆ دەناردن و تاکو ئێستاش بە خۆشحاڵییەوە زۆربەی شیعرەکانم هەر لە «هەنار»دا بڵاو دەکەمەوە.
بابەتەکانی «هەنار» هەمەڕەنگییەکی جوانیان تێدایە و سنووری تەمەنی نووسەرەکان و تەمەنی نووسینیشیانی شکاندووە و دەرگای خستۆتە سەرپشت بۆ هەموو قەڵەمێکی بە بڕشت، ئەگەر چی «هەنار»یش وەک هەر گۆڤارێکی تر ناو بەناو بابەتی وای تێ دەکەوێت کە ڕەنگە ناهاوسەنگییەک لەگەڵ بابەتەکانی تردا دروست بکات، ئەمەش تا ڕادەیەک کارێکی ئاساییە بەو مەرجەی بە ناوی دەستگرتن و هاندانەوە کارێکی وا نەکرێت لە سەنگی «هەنار» بێنێتە خوارەوە و هەر لێرەشەوە سەد دەر سەد پشتگیریی لەوە دەکەم کە گرنگییەکی تەواو بەو قەڵەمە تازانە بدرێت کە خاوەنی ڕەونەق و بریسک و وڕێکی قەشەنگن و ئێمە خۆشمان کاتی خۆی تا ڕادەیەکی زۆر بەدەست نەبوونی دەلاقەیەکەوە دۆش دامابووین کە بەرهەمەکانمانی تێدا بڵاو بکەینەوە بۆیە گەرەکمە زۆر جەخت لەسەر ئەو مەسەلەیە بکەمەوە.
جێی خۆیەتی بە ڕاشکاوانە باس لەوەش بکەم کە ئەوەندەی من شارەزای ستافی «هەنار» بووبم وای دەبینم کە کۆمەڵێک کەسی خەمخۆر و هەمکات بەڕێز لە پشت ئەو شۆخ و شەنگیی و شیرینییەی گۆڤارەکەن و شایەنی ئەوەن لە ئامێزی خۆشەویستیی بگیرێن و ماندوونەبوونییان لێ بکرێت و دواجار بەوان و بە «هەنار» بڵێین هەمیشە بەو ڕەوتە جوانە ڕێ بکەن و دەروونمان پڕ کەن لە مۆسیقای وشەی درەوشاوە.

## بەختیار حمەسوور: ئەوەی ئەم گۆڤارە وەک گۆڤارێکی جیاواز مانیفێست دەکات، خودی قەبارە و دیزاین و دابەشکاری بابەتەکانە

گۆڤاری هەنار، یەک لەو گۆڤارانەیە کە لە یەکەم ژمارەوە ئاگاداریم. هەمیشە ئەو بابەتانەی لەم گۆڤارەدا بڵاو دەبنەوە و دەیان خوێنمەوە، زیاترن لەو بابەتانەی کە نایان خوێنمەوە. ئەوەی ئەم گۆڤارە وەک گۆڤارێکی جیاواز مانیڤێست دەکات، خودی قەبارە و دیزاین و دابەشکاری بابەتەکانە، کە ئەم گۆڤارە هەر لە سەرەتاوە تا ئێستە «بە گۆڕانێکی کەمەوە» کردوویەتی بە موڵک و جیاکەرەوەی تایبەت بە خۆی.

مێژووی هەشت ساڵەی ئەم گۆڤارە بە چەند قۆناغ و ئاستی جیا جیادا تێپەڕیوە، بۆ ئەمە؛ دەکرێ کێرڤی هێڵکاری دڵ بهێنینە پێش چاوی خۆمان. ئەمەیش کێشەی بەشێکی زۆر لە بڵاوکراوە کوردییەکانە، کە ناتوانن بە هێڵێکی ڕێک و یەک ئاراستەدا بڕۆن. ئەڵبەت رابردوو و ئێستەی ئەم گۆڤارە، خاڵی نییە لەم بەرز و نزمییە، هۆکاری سەرەکی ئەم خاڵەیش، نەبوونی فیلتەرێکی چەسپیوە. زۆرجار تووشی جۆرێک لە نائومێدی و بێتاقەتی دەبی، کە دەبینی بە تەنیشت نووسینێکی جوانەوە، نووسینێکی کاڵوکرچیش دانراوە، ئەمەت بۆ ناچێتەوە سەریەک، ئایا ئەم دوو نووسینە بە یەک فیلتەردا تێپەڕیون!؟ ئێمە ناڵێین با هەموو بابەتەکان لە ئاستێکی بەرزی ئێستاتیکدا بن، نا، بەڵام با ڕێ بە نووسینی ناوبۆش و ئێکسپایەریش نەدەین سنگ دەرپەڕێنن. هەنار پێوستە هەنگاوێک بۆ دواوە بنێ، بە مەبەستی هەڵنانی دوو هەنگاو بۆ ئایندە.

هەموو سەری مانگێک شتێک هەیە و من چاوەڕێی دەکەم، بەڵام پێتان ناڵێم چییە.



## بەکر شوانی: هەنار یەکێکە لەو گۆڤارە ئەدەبییانەی کە خزمەتێکی زۆر بە ئەدەبیاتی ئێمە دەکات.

لە دوای راپەڕینەوە ژمارەیەکی زۆر گۆڤار و رۆژنامە هاتنە ناو دنیای میدیا و ئەدەبیاتی کوردییەوە، بەڵام بەشی زۆریان توێشەبەرەی ئەو رێگا دوور و درێژ و دژوارەیان پێ نەبوو یان بۆیان دابین نەکرا، بۆیە بەزوویی لەبارچوون و لە دەرچوون راوەستان. وەلێ گۆڤاری هەنار کە نزیکەی ٨ ساڵە هەموو مانگێک بەرێکوپێکی و بە ناوەرۆکێکی دەوڵەمەند و جوانەوە دەگاتە بەردەستی خوێنەران و ماندوویی و خەمخۆریی سەرنووسەر و ستافی نووسینی پێوە دیارە، یەکێکە لەو گۆڤارە ئەدەبییانەی کە خزمەتێکی زۆر بە ئەدەبیاتی ئێمە دەکات.

بە بۆچوونی من، هەنار بۆ ئەوەی بەردەوام لە پێشکەوتندا بێت و خوێنەری زیاتر بۆ خۆی دابین بکات، باش وایە لە هەر ژمارەیەکدا چەند پەنجەرەیەک بۆ ئەدەبیاتی کوردی (کرمانجیی سەروو) و ئەدەبیاتی گەلانی دەوروبەر، تورکی و فارسی و عەرەبی و پەنجەرەیەکیش بۆ ئەدەبیاتی جیهانی بکاتەوە، بۆ ئەوەی خوێنەری کورد هەمان کات ئاگاداری نوێترین پێشکەوتنەکانی ئەدەبیاتی کوردی و ئەدەبیاتی گەلانی دەوروبەر و جیهانیش بێت. بەڵام مەرجە بابەتەکانی ئەو پەنجەرانە لەلایەن کەسانی لێهاتوو و شارەزای ئەو بوارەوە ئامادە بکرێن.

## بەکر عەلی: هەنار توانی بۆ ئەودیوی سنوورەکانی شاری سلێمانی و هەرێمی کوردستانیش بپەڕێتەوە

ئەزیزم.. ئەفسوس ئێمە لە کوردستانەوە بەردەوام هەواڵی ناخۆش دەبیستین، من هێندەی لەبیرم بێت کەمجار لەو هەرێمەوە مژدەم بیست بێت.. کارەساتە بەڕاستی کولتورێک نەتوانێت مژدە و مزگێنی بەرهەم بهێنێ و تەنیا ئافات و هەواڵی ناخۆش.. بێهۆ نییە رەشبینی و بەدبینی رۆحی هەموو تاکێکی کوردی دروست کردووە، گەر تەماشای تەواوی ئەدەبیاتی کوردی بکەیت، هێندەی جیهانبینی بێهودەگەرایی زاڵە هێندە شادومانی نابینینەوە... ژیان ئازار نییە بە تەنیا، بەڵکو خۆشی و شادی و کامەرانییە. ئەوەی ژیان دەبوژێنێتەوە رۆحی گەشبینییە. ئەگەر نیتچە گوت بێتی، فیلۆسۆفان ویژدانی ئازاراوی سەردەمەکەیانن، ئەوا ئەمە دیوێکی هەقیقەتەکەیە، چونکە بەدیوەکەی تریدا ئەوان ویژدانی ئاسوودەی سەردەمەکەشیانن. من کە نووسینی هەندێک نووسەر دەخوێنمەوە، ئاسوودەییم تیدا بەرپادەکات، کە دەبینم ئەو نووسینە بەرجەستەی رۆحی سەردەمەکەی دەکات و پرەنسیپی هیوا لەسەردەمێکدا دەخولقێنێت کە چ تروسکاییەک لە ژیانی ئەو هەرێمەدا رۆژانە نابینرێت. نووسەری باوی کوردی زۆر گرێدراوی واقیعە، بەلام نووسەری نوێ دەبێت جەنگاوەرێک بێت بۆ تێپەڕاندنی واقیع، هەموو پرۆژەیەکی روناکبیری و سیاسی بەدیدی من دەبێت رۆحی ترانسێندێنتالی تێدا بێت، ئەگەرنا مەحاڵە هیچ گۆڕانکارییەک چێ بێت و بمانخاتەوە نێو بازنەشەیتانییەکە.

ئێمە کە لەم وڵاتە ئەوروپییانە دەژین، شتێک ئاگامان لە مێژووی گەشەکردنی کولتورەکەیانە، ئەم شارستانییە تەنیا لە ئارامی و سەقامگیریدا دروست نەبووە،

بەڵکو لەڕاستیدا لەجەنگ و قەیران و تەنگانەدا گەشەی بەخۆی کردووە... یۆنان لەگەرمترین شەڕدا بوو پلاتۆن بیردەکاتەوە لە دروستکردنی ئەکادیمیایەک بۆ شار، داهێنانە زانستییەکان لە نیوتن و گالیلۆ و ئەدیسۆنەوە تا ئەنیشتاین، هەمووی لەسەدەمی جەنگ و دەسەڵاتی کەنیسەدا کراون، بیرمەندە مەزنەکان هەمووی لە واقیعی دژوار و ناثارامیدا بیریان کردۆتەوە، دەوڵەتەکان هەموویان سیاسەتی درێژخایاندن و ترانسێندێنتالیان پیادەکردووە، شۆڕشەکان هەمووی رەفزکردنەوەی واقیعی باوی زاڵ بوون، هەموو گوتاری مۆدێرنە و پۆستمۆدێرنەی ئەوروپی کەلە نیتچەوە لەدایک دەبێت و بە هایدیگەردا تێدەپەڕێت تا دەگاتە فۆکۆ و دێریدا و لە ئێستادا سلۆتەردایک هەموو بیری ترانسێندێنتال یان هەبووە و ئەوان وەرزێری چاندنی بیرۆکەی هەڵکشانی ستوونین.. لە ئێستاشدا ئەو هەموو دەزگا زانستی و فەلسەفی و ئابووری و سیاسییەی لەم وڵاتانە هەن بەسەدەها گۆڤار و رۆژنامە و رادیۆ و تەلەڤزیۆن و و سایتی ئینتەرنێت تەرخانکراون بۆ بوارەکانی فەلسەفە و ئەدەب و زانست و تەکنەلۆژیا و سیاسەت و ئابوری و ژینگە و هەموو بوارەکانی تر.. سەرباری ئەو قەیرانە داراییەی ئەوروپییەکان لە ئێستادا دەژین تا ئێستا نەمبیستووە یەکێک لەو دەزگایانە دابخرێت.. هەمیشە بایەخی زیاتریان پێ دەدرێت، شارستانییەت وەها دروست دەبێت کە پایەکانی راگرتنی شارستانی جێگیر رابگیرێن، هیوادارم گۆڤاری هەناریش تا دێت بایەخی زیاتری پێبدرێت.

سلێمانی راستە بە بڕیارێکی سیاسی بە فەرمی کرایە پایتەختی رۆشنبیری، بەڵام لە بنەڕەتەوە خۆی منداڵدانی لەدایکبوونی رۆشنبیری بووە، واتە لەڕووی رۆشنبیرییەوە شاربوون و پایتەخت بوونی خۆی دەمێکە بە شاعیرەکانی، بە نووسەرەکانی، بە هونەرمەندەکانی، بە سیاسەتمەدارانی سەپاند بوو.

گۆڤاری هەنار لە ماوەی تەمەنی خۆیدا بەڕاستی توانی دەنگی کۆن و نوێی نووسەرانی هەموو لایەکی کوردستان کۆبکاتەوە، کە ئەمە خەسڵەتێکی پۆزەتیڤی ئیشکردنی گشتگیرییانەی برادەرانی ئەو گۆڤارە بوو، کە خۆیان لە قەفەزی ناوچەگەریدا بەند نەکردبوو، بەڵکو تێپەڕی بوون بۆ ئەودیوی سنوورەکانی شاری سلێمانی و هەرێمی کوردستانیش. لێرەوە ئەم گۆڤارە سیاسەتێکی ترانسێندێنتالی تیا دەبینم کە بۆ ئێستای کایەی رۆشنبیری شتێکی تێپەڕێنەر بوو.. جگە لە هۆکاری دارایی، ئەوا پێناچێت هیچ هۆکارێکی تر لە پشت نیازی داخستنی ئەو گۆڤارەوە بێت. لەم بارەدا شەرمە بۆ وەزارەتی رۆشنبیری یەکێک لە رووگەشترین گۆڤارەکانی خۆی دادەخات کە هاوکات هیوادارم ئەو دەیەها

ملیۆن دۆلارەی لە پرۆژەی تری لاوەکی و بێماناادا سەرف دەکرێت بخرێتە خزمەتی پرۆژەی وەک هەنارەوە چونکە شار بە گۆڤارەکان و رۆژنامەکان و شانۆکان و هۆڵەکان و سینەماکان و چایخانە و کافێکان و باخچەکان و نێوەندەکانییەوە لە گوندەوە دەبێتە شار.
لەگەڵ رێزی زۆرمدا.



## هونەرمەند جیهاد دڵپاک: هەنار گۆڤارێکە شانبەشانی چەندین گۆڤاری دی توانی خزمەت بە بزاڤی رۆشنبیریی و هونەریمان بگەیەنێت

بەبۆنەی ساڵیادی دەرچوونی گۆڤاری (هەنار)ی ئازیز گەرمترین پیرۆزبایی لە سەرجەم ستافی گۆڤارەکە دەکەم و دەستخۆشیی لەهەموو ئەو قەڵەمە رەنگینانە دەکەم، کە لە کاروانی بەرەوپێشەوەچوونی گۆڤارەکە قەڵەمەکانیان کارابوو، هەنار گۆڤارێکە شانبەشانی چەندین گۆڤاری دی توانی خزمەت بە بزاڤی رۆشنبیریی و هونەریمان بگەیەنێت و لە ئاسمانی رۆژنامەوانیی هونەریدا ئەستێرەیەکی پرشنگدار و دیاربێت.

لە (هەنار)ی ژمارە (٣٦)ی ساڵی ٢٠٠٩-ەوە وەرگیراوە.



## داستان بەرزان: بۆ من، گۆڤاری هەنار لە یەکەمین دەروازەکانی بڵاوبوونەوەی نوسینەکانم بووە

* ساڵی ٢٠٠٨ بۆ یەکەمین جار نوسینم گەیشتە دەستی ستافی گۆڤاری هەنار، پاش ماوەیەک لە گەیشتنی نوسینەکەم لە یەکێک لە ژمارەکانی ئەو ساڵەی گۆڤارەکەدا بڵاوبووەوە، ئەوەی بۆ من خۆشبوو بەڕێزانی ئەو گۆڤارە جگە لەوەی منیان نەدەناسی تەنانەت لە نزیکیشەوە کەسیانم نەدیبوو، بۆیە لەوێدا هەستم کرد مامەڵەی ئەوان لەگەڵ دەقدا بووە نەک لەگەڵ خۆمدا، ئەمەش وایکرد متمانەیەکی زیاتر بە نوسینەکانم بکەم، بۆ من گۆڤاری هەنار لە یەکەمین دەروازەکانی بڵاوبوونەوەی نوسینەکانم بووە.

*گۆڤاری هەنار لە ماوەی تەمەنی کارکردنیدا هەوڵیداوە لەگەڵ نوسینی نەوەکانی پێشوودا گرنگی بە نوسینی لاویش بدات، کە ئەم خەسڵەتەم لە گۆڤاری (گەلاوێژ نوێ)شدا بینیوە، بێئەوەی جیای بکەنەوە ئەمە نوسینی لاوە یان بەتەمەن، بەڵکو بە پێی هەڵسەنگاندنێکی ئەدەبی کار دەکەن. کە بە پەژارەوە لە هەندێک گۆڤاری ئەدەبی دیکەدا وانییە، هەتاکو دۆستانی خۆیان و ئەندامان و نزیکەکانی خۆیان وەستابێت، کەمتر دەیانپەرژێتە سەر گرنگیدا بە گەنج، تەنانەت ئەگەر بیشیان پەرژێت بۆ پڕکردنەوەی بۆشاییە نەک لەبەرچاوگرتنی ئاست و توانا.

* پابەندبوون بە کاتی دەرچوونی گۆڤارەوە خاڵێکی گرنگە بۆ هەر گۆڤارێک، ئەوەش وادەکات خوێنەر باشتر لەگەڵ گۆڤارەکەدا بڕوات و بێ دابڕان ئاگاداری کارەکانی گۆڤارەکە بێت، کە ئەمە لە گۆڤاری (هەنار و رامان)دا زۆر بەباشی کاری پێدەکرێت و وایکردووە خوێنەر بەردەوامی بە خوێندنەوەیان بدات و تاکو ئێستاش وەک دوو گۆڤاری باشی ئەدەبی بەردەوامی بەخۆیان بدەن.



## دیدار مەسیفی: هەنار دەیەوێت هەردەم چاکترین شت دەگەڵ خوێنەر بکات

تیپی (هێ) شێوەی لە دڵ و گوڵ دەچێت. گۆڤاری هەناریش کە لە دەستپێکدا ئەم تیپە جوانەی بۆ خۆی هەڵبژاردووە، دیارە دەیەوێت هەردەم چاکترین شت دەگەڵ خوێنەر بکات. ئەوە هەستێکی سەرەتاییە و هەناسەش بە هەڵمژینی هێیەک و دووبڕە ئۆکسیجین ئاو دەهێنێتە نێو زار.

هەنار یەک لە میوە کۆنەکانە و لە هەر سێ کتێبە پیرۆزەکان بە جیددی ناوی هاتووە.

لێ، هەنار لە هەموو میوەکانیش پتر لە رۆحی کوردانەوە نزیکە.

نیشانەیش، ئێمە لە لایەک هەنار دەچین و لە لایەکی دیکەش لە نەتەوەکانی دراوسێشمان پتر قەدری ئەم میوەیە دەگرین.

ئێمە هێیەکەی سەرەتا بە هەنسکێکی قووڵ دەڵێین، وەک ئەوەی هەناسەیەکی ئەبەدی و هەستێکی قووڵ لە ناخمان بەجێمابێت.

تورک و فارس هێیەکەی ناڵێن، عەرەبیش تیپی (هێ) دەخاتە سەر (رمان) و دەیتەقێنێتەوە.

ئایا لە خۆشەویستی هەنارە نییە، ئێمە بۆمبایەکی دەستیی وەها لە بڕی هەنارۆک بە نارنجۆک ناوزەد دەکەین.

کورد هەنار بۆ ناونانی کچ، گۆڤار، رۆمان و شیعر یان هەر شتێکی دیکە هەڵدەبژێرێت کە شایانی جوانی و تێڕامان بێت.

هەنار لە هەموو میوەیەک پتر لە مەمک دەچێت، لەم ئەندامە جوانەی کە رەونەقی هەزار بە هەزاری دەنکە وردەکانی، جوانی و چێژ و نەمریی هەیە... شیر و شەرابێک کە ژین و ژن تیایاندا یەک مانایان هەیە!

پیرۆزبایی گەرمم بە گۆڤاری قەشەنگی هەنار دەڵێم و هیوای بەردەوامیی بۆ دەخوازم.

دەکرێت هەرساڵێک و لە مانگی پێگەیشتنی هەناردا، گۆڤاری هەنار لاپەڕەکانی بە چوار بەش و چێژی هەنار بڵاو بکاتەوە. «تفت (بۆ فیکر) – ترش (رەخنە) – مێخۆش (هونەر) – شیرین (ئەدەب)».



## دلاوەر قەرەداغی: هەنار بۆ من ماڵێکی ئاشنا بووە و چەندێک بوارم هەبووبێ هاموشۆم کردووە و وەک ماڵی خۆم لە دەرگەیم داوە

گۆڤاری هەنار لەو گۆڤارانەیە کە سەنگ و رەونەق و جوانیی تایبەتی خۆی هەیە بە تایبەتییش لەو قەرەباڵخییەی دونیای ئێمەدا کە وردە وردە گۆڤار و بڵاوکراوە ئەدەبییەکان دەدەنە کزی و بێباکانە یان دادەخرێن یاخود تەنگەنەفەس دەکرێن و ناچار بە داخستن دەکرێن. هەنار لە ماوەی هەشت ساڵی تەمەنیدا بۆ من ماڵێکی ئاشنا بووە و چەندێک بوارم هەبووبێ هاموشۆم کردووە و وەک ماڵی خۆم لە دەرگەیم داوە.. بە تایبەتی لەو ساڵانەی لە دەرەوە ژیاوم، هەنار پەنجەرەیەکی رووناکی ئەدەبیی بووە کە هەمیشە بە روومدا کراوە بووە و فەرمووی لێ کردووم و بە یەکێک لە خۆی زانیوم... دیارە ئەمەش بەشێکی زۆری دەگەڕێتەوە بۆ ئەدەب و سەلیقە و خۆنەویستیی سەرنووسەر و دەستەی نووسەرانی بەڕێزی گۆڤارەکە و بە تایبەتییش کاکە محەمەد کوردۆ کە بە هێمنیی و ئارامییە جوانەکەیەوە هەنار دەردەچوێنن.. سوپاس و پیرۆزبایی بۆ هەنار... بە هیوای بەردەوامیی و پێشکەوتنی زیاتر.



## هەندرێن: هەنار: ژمارە دوای ژمارە بابەتی باشترو دەنگی نوێ و نەناسراو بە خوێنەرانی دەناسێنێت

لەوەتەوەی من (هەنار) دەخوێنمەوە دوای هەر ژمارەیەک هەست دەکەم ئەو گۆڤارە لە هەوڵی ئەوەدایە لە بواری وتار، راڤەکردن، رەخنە، هزر، شیعرو چیرۆک، وەگێڕان و بواری هونەریی و بگرە هەندێکجاریش تەوەرکردنەوەشدا، بەرەوپێش بڕوات. لەوەش زیاتر، ئەوەی کە دڵی من خۆش دەکات ئامێزکردنەوەیە بۆ دەنگە نوێیەکانی ئەمڕۆ، توانای ئەو شاعیر، نووسەر، هونەرمەند و نووسەرانەی کە بەهۆی ئەو ئەقڵ، نەریت، بازرگانی و سیاسییانەی کە لەکن بەڕێوەبەرانی گۆڤارە پیرەکاندا هەیە، ئاوڕیان لێ نادرێتەوە. یەکێک لە ئەرکەکانی گۆڤار دەبێت هاندانی دەنگەنوێیە ئەدەبی و رۆشنبیرییەکان بێت، تاکو ژیانی کولتووریی کوردیی بفراژێت و ئاشنای هزرو ئاسۆ نوێیەکانی رۆشنبیریی بین.

باشی هەنار لەوەدایە، کە ژمارە دوای ژمارە خولیای فروانبوون و بەرگرتنی هەیە. لە هەر ژمارەیەکدا بەرهەمی نووسەر و شاعیری جیاواز و نوێ بەخوێنەرانی دەناسێنێت. ئەمەش وایکردووە کە نووسەر و شاعیر حەز بکات بەرهەمەکانی لە (هەنار)دا بڵاوبکاتەوە.

بەکورتی، خاڵە پۆزەتیڤەکانی هەنار: ژمارە دوای ژمارە بابەتی باشترو دەنگی نوێ و نەناسراو بە خوێنەرانی دەناسێنێت، کە وەک وتم ئەو کارە گرنگی خۆی هەیە بۆ گراژانی بواری کولتووریی و هاندانی نووسەری نوێ. ئەمەش بە رۆڵی خۆی ئاسۆی نوێ بۆ خوێنەر ئاوەڵا دەکاتەوە. هەروا دەرچوونی «هەنار» بەشێوەیەکی رێکوپێک، متمانەخۆی لای خوێنەر و نووسەرانی دروستکردووە.

لە (هەنار)ی ژمارە (٣٦)ی ساڵی ٢٠٠٩-ەوە وەرگیراوە.



## هێمن عـوسمان عەبدوڵڵا: هەنار تا ڕادەیێکی باش توانیویەتی پێگەیەکی ئەدەبی، ڕووناکبیری، هونەریی، هەبێت لەنێوەندی ڕۆژنامەوانی کوردیدا

ئەو گۆڤار و پاشکۆ ئەدەبیانەی لەم هەرێمە بڵاو دەکرێنەوە ژمارەیان کەمە. ئەوانەی ئێستا و پێشتریش بڵاو بوونەتەوە، دوایی چەند ژمارەیەکی کەم وەستاون جا بەهەر هۆیەک بێ.

خۆشبەختانە گۆڤاری هەنار بۆ نۆساڵە بەردەوام بڵاو دەبێتەوە، لە هەمان کاتدا گۆڤار هەبووە هەشت ساڵ لەمەو بەر هاوشانی هەنار بڵاو بووەتەوە و لە دوایی چەند ژمارەیەک نەمانبینیوەتەوە، ئێمە لەژمارە سەرەتاکانیەوە خوێندوومانەتەوە و لە وادەی خۆیدا هەوڵی بەچنگ خستنیمان داوە، نەک بۆ ئەوەی سەرسام بووم بە بابەتەکانی، بەڵکو لە هەردوو باری پەسەند بوون و پەسەند نەبوونی بابەتەکانیدا خوێندوومەتەوە. ئاخر بۆ ئەوەی ئێمە نووسینێک پەسەند بکەین یاخود ڕەت بکەینەوە دەبێ لەهەردوو بارەکەدا بیخوێنینەوە، هەنار تا ڕادەیێکی باش توانیویەتی پێگەیەکی ئەدەبی، ڕووناکبیری، هونەریی، هەبێت لەنێوەندی ڕۆژنامەوانی کوردیدا، بەتایبەتتر لەنێو کۆوار و پاشکۆ ئەدەبیەکاندا.

لەگەڵ ئەوەشدا زۆرجار بەر تێکست و نووسینی لاواز دەکەوین، من نازانم بەچ پێوەرێک بابەتەکان هەڵدەسەنگێنرێن و دواتر پەسەند دەکرێن بۆ بڵاو کردنەوە؟ ئاخر هێندێ جار هەیە وەک ڕۆمانێک تەواوی دووسەد لاپەڕەکەی دەخوێنمەوە و هێندێک جاریش کەمترین لەنووسینەکانی لام پەسەندە. هێندەی دەردەکەوێ پێوەری هەڵسەنگاندن بۆ بڵاوبوونەوە جێگیر نییە و دۆخێکی مەتاتی هەیە. قسەیەک هەمیشە دەکرێت دەڵێن: «زۆرێک لە گۆڤارە ئەدەبیەکان لەسەر بنەڕەتی پەیوەندی کەسی بابەتەکان بڵاو دەکەنەوە»، دەخوازم ئەمە بۆ گۆڤاری هەنار بەڕاست نەگەڕێ.



## هەڵاڵەی پێنجوێن: هەنار سەرمایەیەکی فیکریی و ئەدەبی بەهێزە بۆ کتێبخانەی کوردی

(هەنار)ی ئازیز هەر لە سەرەتاوە بە ستایلێکی جیاواز و تایبەت بەخۆی کاریکردووە، من دەتوانم بڵێم لەسەر بنەمایەک پێگەی خۆی قایمکردووە کە دوور بووە لە تەقلیدییەت و دووبارەبوونەوە، (هەنار) لە زۆربەی بوارە ئەدەبی و هونەرییەکاندا کاری خۆی کردووە و بێ جیاوازیی هەر لە وەرگێڕان و ئەدەبی چیرۆکنووسین و کردنەوەی مەلەف بۆ شیعر و بۆ بابەتی دیکەو چاوپێکەوتن و باشترین بابەتە رەخنەییەکان.

زۆرجوان ئیختیاری بابەتی کردووە، توانیویەتی گرنگترین بابەتی ئەم سەردەمە هەڵبژێرێت و بیگەیەنێتە خوێنەری کوردی لەڕووی فۆڕم و ناوەرۆکەوە، لەڕووی دیزاین و بەرگیشەوە توانیوبەتی تایبەت بێت، من (هەنار) وەک جوانترین گۆڤاری ئەم شارە دەبینم بە چەشنێک بینینی گۆڤاری (هەنار) لەناو کتێبخانەکەماندا نەک سەرنجی منی بۆلای خۆی راکێشاوە، بەڵکو سەرنجی میوانەکانیشمی بۆ لای خۆی راکێشاوە، هەنار سەرمایەیەکی فیکریی و ئەدەبی بەهێزە بۆ کتێبخانەی کوردی، بەو هیوایەم لە ساڵی نوێی تەمەنیدا بە هەنگاوی جیاوازتر و باشتر دەربکەوێت، چونکە زیاتر لە رێی ئینتەرنێتەوە لە هەموو شار و وڵاتەکانەوە بە دەرەجەیەکی باش خوێنەری کوردی موتابعیەتی.

لە (هەنار)ی ژمارە (٣٦)ی ساڵی ٢٠٠٩-ەوە وەرگیراوە.



**حەمەی مەلا کەریم: هەنار بەو تەمەنەیەوە خزمەتێکی باشی کردووە، بە بەردەوامیشی خزمەتی زیاتر دەکات**

راستی بەهۆی تەندروستیمەوە دەمێکە ناتوانم گۆڤارو رۆژنامەکان ببینم، بەڵام ئەوەندە دەڵێم هەنار بەو تەمەنەیەوە خزمەتێکی باشی کردووە، بە بەردەوامیشی خزمەتی زیاتر دەکات، من هیوای تەمەن درێژی بۆ دەخوازم. حەزدەکەم چەندین گۆڤاری ترمان هەبێ خزمەت بە فەرهەنگی کوردی و ئەدەبیاتی کوردی بکات. دەستخۆشی خۆشم بۆ ستافی ئەم گۆڤارە.



## حەمە کاکەڕەش: (هەنار) لەدوای ژمارە بەراییەکانییەوە ژمارە لەدوای ژمارە لەڕووی بابەتییەوە دەوڵەمەند و بەپێزتر بووە

من وەک خوێنەرێکی گۆڤاری (هەنار) لەو دۆخە هیلاک و داپۆشراوەی دونیای ڕۆشنبیریی و ئەدەبی کوردیدا کە هەموو دەنگ و هەناسەو جووڵەیەک بە سیاسەت خەسێنراو و بێ ڕۆح کراوە، لە وەها دۆخێکدا کە خەمخواردن لە زمان و ئەدەب و ڕۆشنبیریی میللەتێک هیچی وای نەماوە بۆ لەبیرچوونەوە، ئا لەم دۆخەدا دەبینم کۆمەڵێک خەمخۆری زمان و ئەدەب و وشەی کوردی بە ئیمکانییەتێکی زۆر کەم کە ناکاتە لەسەدا یەکی ئەو پارەو پوولەی کە بۆ زۆر بەناو فێستیڤاڵ و پرۆژەی ڕۆشنبیریی خەرج دەکرێن، ئا بەو ئیمکانیاتە کەمەوە دەروێشانە عەشقیان بۆ زمان و وشەی کوردی وایکردووە لێبڕاوانە گۆڤاری (هەنار) دەربکەن، کە دەتوانم بڵێم: (هەنار) بەشێوەیەکی گشتیی لەدوای ژمارە بەراییەکانییەوە ژمارە لەدوای ژمارە لەڕووی بابەتییەوە دەوڵەمەند و بەپێزتر بووە.

لە (هەنار)ی ژمارە (٣٦)ی ساڵی ٢٠٠٩-ەوە وەرگیراوە.



## کۆچەر ئەبوبەکر: ئەوەی ناوە ناوە دڵخۆشمان دەکات چەند هەوڵێکی دڵسۆزانەیە و دیارە گۆڤاری هەناریش بەرجەستەترین و کاریگەرترین و پڕ بەهرەترینی ئەم هەوڵانە بووە

پێناچێت سنوری راستییەکان ببەزێنین، گەر بڵێین ئێمەی گەلی کورد بێ ئەرشیفترین گەلی کەونین، بە گوێرەی ئەمەو هێندەی ئەوەی من پێویستمە گەلێکین بێ ئەرشیفی ئەدەبی و بێ زاکیرەی دەستەجەمعی کۆمەڵایەتی و بێ زاکیرەی ئەدەبی و دواجار گەلێکی بێ باوەڕی گشتی ئەدەبین، بەڵام ئەوەی ناوە ناوە دڵخۆشمان دەکات چەند هەوڵێکی دڵسۆزانەیە و دیارە گۆڤاری هەناریش بەرجەستەترین و کاریگەرترین و پڕ بەهرەترینی ئەم هەوڵانە بووە، زۆرجار دڵخۆش دەبین، کە مانەوە و بەردەوام بوونی گۆڤارێکی وەک هەنار لە داهاتوودا یان لانی کەم نەوەکانی داهاتووی ئەم گەلە ئەرشیفێکی ئەدەبی و باوەڕێکی گشتی ئەدەبیان هەبێت.

بە بۆچوونی منیش وەک خوێنەرێکی هەنار یەکێک لەو بەرهەمانەی، کە هەنار دەتوانێ بۆ هەمیشە شانازی پێوە بکات و بگرە لە گۆڤارە هاوشێوەکانیشی جیای دەکاتەوە پێگەیاندن و ناساندنی چەندین بەهرەمەندی دنیای ئەدەب و رووناکبیری کوردییە و لێبووردوانە خۆی کردوە بە چوارچێوەیەک بۆ کۆکردنەوە و دواجار رێکخستنی ئەندێشەی پەرت و بڵاوی میوانەکانی ئەدەب و رووناکبیری کوردی.

هەڵبەت هەنار جیا لەمە توانیویەتی ئەرکێکی ئەدەبی گرنگ و مەزن جێبەجێ بکات، ئەویش بارز کردنی هێڵی نێوان شیعر و تێکستە و هیوادارم گرنگی زیاتر بەم لایەنە بدەن و رێگە لەو شێواندنە بگرن، کە ئێستا لێرەولەوێ دەبینرێت. هەر هەموومان هیوای سەرکەوتنی بۆ دەخوازین، کە سەرکەوتنی هەنار سەرکەوتنی ئێمەشە، چ وەک خوێنەر و چ وەک شاعیر.



**کاروان عومەر کاکەسوور: ئەوەی (هەنار) لە زۆر گۆڤاری دیکە جیا دەکاتەوە، ئەوەیە، کە بە سەرەتایەکی سادە دەستی پێ کرد و بەردەوام بۆ ئاستی بەرزتر لە جووڵەدایە**

هەر خێرا پێوەندییم لەگەڵ (هەنار)دا لەوە دەرچوو، کە تەنها پێوەندیی نووسەرێک بێت بە گۆڤارێکەوە، بەڵکو ئەو پێوەندییە بۆ پێوەندییەکی پێرسۆناڵی گۆڕا.
ئەوەی (هەنار) لە زۆر گۆڤاری دیکە جیا دەکاتەوە، ئەوەیە، کە بە سەرەتایەکی سادە دەستی پێ کرد و بەردەوام بۆ ئاستی بەرزتر لە جووڵەدایە. خاڵێکی پۆزەتیڤی دیکە لەو ستافەدا هەیە، کە هەر نووسەرێک رۆژێک لە رۆژان بابەتی بۆ ناردبێتن، هەستی پێکردووە، ئەویش شێوازی مامەڵەکردنیانە لەگەڵ نووسەران.
لە (هەنار)ی ژمارە (٣٦)ی ساڵی ٢٠٠٩-ەوە وەرگیراوە.



## گۆران رەئوف: هەنار لە دیدگای مندا تەنها گۆڤاربوو کە ناوی نوێ و نوسینی نوێم لێوە دەبینی

گۆڤاری هەنار وەک هەموو پرۆژە و بڵاوکراوە رۆشنبیری و ئەدەبییەکان بێ کەموکورتی نییە و بەدەرنییە لە پرسیار و رەخنە! بەڵام گەر وردتر و گشتگیرتر تەماشای ئەم گۆڤارە بکەین، وەک پرۆژەیەکی سەقافی و ئامانجدار، ئەو پرسیارە دێتە پێش ئایا تاچەند ئەم گۆڤارە ئامانجی خۆی پێکاوە؟ یاخود ئامانجی دەپێکێت؟ هەستەکەم لێرەوەیە دەتوانین کاریگەری و رۆڵی هەستپێبکەین، چونکە هەنار لەماوەی ئەو ساڵانەی کارکردنی بەگشتی ئیشی لەسەر بواری رۆشنبیری و ئەدەب و هونەر کردوە، لەکاتێکدا زۆر گۆڤار و بڵاوکراوە هەبوون و هەن کە هاوشێوەی ئەم پرۆژەیە لە مەیداندابون و رۆڵی جیاجیان هەبووە... بەڵام ئەوەی وادەکات گۆڤاری هەنار جودا لە هەموو گۆڤار و بڵاوکراوەکانی دیکە تەماشابکرێت، جەختکردنەوەی بووە لە پیشاندان و نمایشکردنی گوتار و پەیامی ئەدەبی و هونەری نەوەی نوێ، هەنار لە دیدگای مندا تەنها گۆڤاربوو کە ناوی نوێ و نوسینی نوێم لێوە دەبینی، تەنها پرۆژەیەکی رۆشنبیری بوو هەر لەسەرەتای کارکردنییەوە دەرگای بۆ گەنجان کردەوە، تا بتوانن خۆیان بەیانکەن.. لێرەدایە دەگەینە ئەو خاڵەی گۆڤاری هەنار پرۆژەیەکی سەرکەوتوبووە لە پێشخستن و هاتنەناوەوەی دەنگە نوێکان.

بەهیواین ئەم گۆڤارە ئازیزە مانگ بە مانگ و ساڵ بە ساڵ لەبرەودابێت و بتوانێت زیدەتر بڕوات بەرەو ئامانج و وێنای راستەقینەی خۆی، دەخوازم ئەو ستافەی لەم گۆڤارەدا کاردەکەن، زیاتر جەختبکەنەوە لە بڵاوکردنەوەی هەنار لە شار و شارۆچکەکاندا، هەستدەکرێت وەک پێویست ناگاتە قەزا و ناحییەکان.



# لەتیف هەڵمەت: هەنار، هەنووکە باشترین گۆڤاری هەرێمی کوردستانە

زۆرجار کە بە ژمارە کۆنەکانی گۆڤاری -شعر-ی لبنانی و-الاداب- و هەروەها گۆڤاری-شعر ٦٩ی عێراقی و -الاقلام- و -أفاق عربیة- و -الثقافة الاجنبیة-الکلمة-دا دەچوومەوە و بابەتەکانیم دەخوێندەوە هەستم بەوە دەکرد کە ئەم جۆرە گۆڤارانە زیندوویتی و بزۆزییەکی ئەوتۆ دڵگیرو سەرنجڕاکێشیان تیادایە، هەرگیز کۆن نابن و هەرگیزیش لە دووبارە خوێندنەوەی بابەتەکانیان قەڵس و بێزار نابم و وام هەست نەدەکرد بابەتگەلێک دەخوێنمەوە کە جاری دیکە خوێندوومنەتەوەو ئەم بارودۆخەم بەراورد دەکرد لەگەڵ هەندێ گۆڤاری دیکەدا کە بە عەرەبی و کوردی دەردەچوون و تاقەتم نەبوو، یا هەر نەمدەتوانی زۆربەی بابەتەکانیان یەک جاریش بەشێوەیەکی لامسەرلایش بخوێنمەوە...

بەڵام کاتێ گۆڤاری (هەنار)م بینی، هەر لە یەکەم ژمارەیەوە سەرنجی ڕاکێشام و ژمارە لە دوای ژمارەش زیاتر گەشەی کردو زیاتر پێشکەوت و زیاتر بایەخی بە نوێگەری و دەقی نوێ و شیعری نوێ و ڕەخنەو سینەما و شانۆی نوێ و چیرۆکی نوێ داو پەنجەرەکانی خۆی بۆ هەموو ڕێبازو تەوژمە ئەدەبی و هونەرییە نوێکانی جیهانی خستە سەر پشت و شانبەشانی ئەوەش بایەخێکی نوێ بە بەرهەم و هەمەجۆری لاوان دەدات و لە لاپەڕەکانی گۆڤاری (هەنار)دا دەیان شاعیرو نووسەری بەهرەمەندی لاو و گەنجم ناسی و خۆیشم هەر لە سەرەتای دەرچوونییەوە حەزم کرد لە هەناردا بابەتەکانم بڵاوبکەمەوە، چونکە نەخشەسازی گۆڤارەکەش هەر لە ئاستێکی بەرزدایەو زۆر بەدەگمەنیش هەڵەی تایپ دەکەوێتە بابەتەکانی گۆڤاری (هەنار)ەوەو ئەمەش خەسڵەتێکی گرنگی هەنارەو لە کەم بڵاوکراوەی دیکەدا ئەم خەسڵەتە جوانە بەدیی دەکرێ و بەلای منەوە چ وەکو شێوەو چ وەکو ناوەڕۆک و چ وەکو قەبارە گۆڤاری (هەنار) هەنووکە باشترین گۆڤاری هەرێمی کوردستانەو پیرۆزبایی ساڵیادی دەرچوونی لە عاشقانی وشەی کوردی دەکەم و هیوادارم و دەخوازم سەدان و هەزاران ژمارەی دیکەی لێ دەربچێت و هەمیشە ئەم ڕەوتە جوانەی بەرەو پێشتر و پێشتر بڕوات.



**مەجید عەزیز: بوون و درێژەپێدانی ژیانی ئەم گۆڤارە بوون و پەرەپێدانی ئەدەبی کوردیشە.**

من هەرچیەک بەکوردی بخوێنمەوە، بەتایبەتی بابەتی نوێی ناو گۆڤارەکان دیارە لەسەر ئینتەرنێتەوەیە، بەدەگمەن کتێبی ئاساییم بەرچاودەکەوێت بۆ کڕین و خوێندنەوە. بەهەمان شێوە، بۆ چەند ساڵێکی زۆرە گۆڤاری هەنار لەسەر ئینتەرنێت دەخوێنمەوە، هەرکاتێک ئاگاداری ژمارەی نوێی بم دەرچووبێت بەخێرایی تەماشامکردوەو خوێندمەتەوە.

ئەگەرچی لەوەدەچێت دونیای رۆشنبیری کوردی لەئێستاماندا گۆڤارو بڵاوکراوەی زۆری تیادایە، بەڵام کارێکی ئاسانە هەست بەوە بکەین، زۆربەی گۆڤارەکان یان کۆنترۆڵکراون، یان بەهەمانشێوازی سیاسی تەقلیدی بەناوی ئەدەب و فکرەوە دەستیان بەسەرداگیراوە. ئەمە ئەوە ناگەیەنێت لەناو ئەو گۆڤارانەدا بابەتی باش نەبێت، بەپێچەوانەوە بابەتی باش هەیە، بەڵام ئیحتیمالاتەکان لەبەردەم نووسەراندا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو جۆرە بیرکردنەوە زۆر تەقلیدیە کە شێوازی سیاسی دونیای ئێمەی گرتۆتەوە. بەکورتی باسکردن لەباش و خراپەی نووسین نییە لێرەدا، چەند باسکردنە لەکردنەوەی ئەگەرەکان بەسەر خوودی نووسیندا. بەلای منەوە هەموو ئەو گۆڤارانە بەباش و خراپەوە، هەموو تینوێتی خوێنەر ناشکێنن وەکو ئەو تینوێتیە ئەدەبیەی لەلای خوێنەری باش هەیەو شەیدای ناسینی شتێکی ترە ناوەکەی نەبینیەوە زووتر نەیناسیوە.

پێم وایە هەنار وەکو گۆڤارێکی ئەدەبی ئیشی باشی کردوەو بەرهەمی باشیشی بڵاوکردۆتەوە، لەبەرئەوە بوون و درێژەپێدانی ژیانی ئەم گۆڤارە بوون و پەرەپێدانی ئەدەبی کوردیشە.

ئەوەی بەلای منەوە زۆر گرنگە بۆ ئاماژەکردن بەگۆڤاری هەنار، وەکو ئەوەیە

گۆڤارەکە جۆرە شووناسێکی هەبێت، یان شووناسێکی بۆخۆی درووستکردبێت. یەکێک دەتوانێت بەوجۆرە تەماشای بکات، ئەویش هەوڵدانێتی بۆ بڵاوکردنەوەی بەرهەمی گەنجان بەگشتی، ئیدی هیوادارم ئەمە خۆی لەسنووری باشەو خراپەی (نووسین و نووسەر) رزگاربکات و هەوڵبدات روو بەسەر ئەگەرە جیاوازەکاندا بکاتەوەو خۆی لەپرۆژەی داخستن بەسەر پەنجەرەی ئەدەبی نوێدا نەبینێتەوە. ئەدەب، بەسروشتی خۆی هەمیشە تینوە بەبیرو هەست و بەرهەمی نوێ، ئەمە خوودی گەنجان لەخۆدەگرێت کە چۆن مامەڵە لەگەڵ بوون و ژیان و هەست و بیردا دەکەن، لەبەرئەوە خوێندنەوەی بەرهەمەکانیان دەبێتە دۆکیومێنتی ئەو ئەگەرە ئەدەبیانەی ژیان دەدەن بەکەلتوورو ئەو بەهایانەی لەسنووری فکری و کەلتووریدا دەخولێنەوە.

ئەوەی مەبەستمە رەنگە ئەمەبێت، تۆمارکردن و تۆخکردنەوەی رۆحی نەوە حاڵەتێکی گرنگە، بوونی نەوە گرنگی زۆری هەیە بۆ دونیای ئەدەبی و فکری. رێزگرتنی گەنجان، بەشێکی گرنگە لەو پرۆژە ناتوورالەی کەلتوورو ئەدەب و کۆمەڵگا لەناو بەرهەمەکانیاندا خۆی دەبینێتەوە، بەتۆمارکردنی(بڵاوکردنەوەی) بەرهەمەکانیان رێزگرتنی هەست و هزرو پێداویستیە رۆحیەکانیشیان لەئامێز دەگیردرێ. بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت هەر بەرهەمێک گەنجانە بێت (گەنج نووسیبێتی) یەکەمەو لەهەموو ئەوانی تر باشترە، نەخێر، بەڵکو مەسەلەیەکی ترە، ئەویش گرنگی پێدان و بەهەند وەرگرتنی ئەو مادانەیە بیری لێدەکەنەوەو لەلای ئەوان شایستەی ناسینەوەو لێدوانەو دواییش رەنگە ئەو مادانە ببنە خوودی لێکدانەوەی ژیانیشیان لەزۆر ئاراستەی جیاوازەوە. یەکێک لەسیماکانی گۆڤاری هەنار بینینی ئیمجی گەنجانە، بێگوومان گۆڤاری هەنار بەرهەمی شاعیرو نووسەرانی دیکەشی بڵاوکردۆتەوە، بەڵام هەستکردن بەوەی دەیەوێت گرنگی بەگەنجان بدات کاراکتەرێکی هاوچەرخانەی گۆڤارو پرۆژەی ئەدەبیە.

من کاتێک هەنار دەخوێنمەوە، لەڕاستیدا زیاتر بەشی دەقە شیعرەکانییم لەخەیاڵەو دەستدەکەم بەخوێندنەوەی دەقە ئەدەبیەکان، بەتایبەتی لەکاتێکدا شیعری کوردی تەنیا لەسەر ئینتەرنێت دەبینم. هەروەها، گوومانم لەوە نییە کە زۆر لەشاعیرە گەنجەکان هەن کە لەهەناردا شتیان بڵاوکردۆتەوە، رەنگە لەگۆڤارە دیارەکانی تردا رەفز کرابێتن و بەشایستەوە مامەڵەیان لەگەڵدا نەکرابێت، ئەگەر ئەمە راستی خۆی تیادابێت (بەباش وخراپ) مافی پرسین و پیاداچوونەوەیە. دیارە ئەمە بەلای منەوە گرنگی خۆی هەیە، رەنگە پرسیاریش نەبێت لەخوودی باشەو خراپەی بەرهەمەکان، بەڵکو پرسیارە لەڕووی ئەوەی ئەو گۆڤارانەی تر چەند ئامادەن

بەرهەمی گەنجان و بەتایبەتی بەرهەمی نووسەرە نەناسراوەکان بخوێننەوەو دواییش بڵاوبکەینەوە؟ کاتێک گۆڤارێکی تر دێت و دەیەوێت ئەوکارە بگرێتە ئەستۆ ئیتر دەبینین کە پێچێکی کەلتووری دەکاتەوەو دەیەوێت بەشێوەیەکی تر مامەڵە لەگەڵ نووسەرو نووسیندا بکات.
ئالێرەدایە بەلای منەوە، جۆرە بزووتنەوەیەک دێتە ئاراوە وەکو پێداویستیەکی فکری کە تەنیا لەناو بازنەی باش و خراپەدا نییە، بەڵکو لەسەرو هەردووکیانەوەیە. کاتێک گۆڤارێکی وەکو هەنار جۆرە بۆشاییەک پڕدەکاتەوە بۆخۆی ئەگەر بیەوێت یان نا، جۆرە هەستێکی یاخیانە بۆخۆی دروست دەکات و دواییش بۆخۆی وەکو گۆڤارێکی جیاواز لەشووناسی ئەوانی تر خۆی مانیفێستدەکات. ئەوەی گرنگ بێت بۆ من ئەوەیە جۆرە هەستێک هەیە ئاماژە بەوانە دەکات کە لەپەراوێزدان و بێدەسەڵاتن، بەڵام خۆیان (نووسینەکانیان) لەشوێنێکی تردا دەبیننەوە کە جارێکی تر هەستکردن بەدەسەڵات لەلایان دەبوژێتەوە. چونکە ئەو شەپۆلەی(نموونەی گۆڤارێک لاپەڕەکانی تەرخان نەکراوە بۆ قەبیلەیەک بەتەنیا) دەیەوێت و پەرۆشی ئەو بەرهەمانەیە کە رەنگە یەکێک بەناوی گەنجانەوە، یان بەناوی غەریبانەوە، یان بەناوی نەناسراوانەوە، یان بەهەرناوێکەوە بێت، کە لەڕاستیدا شەیدای ئەوەن نووسینەکانیان چاپ بکرێت و بخوێنرێتەوە. بەمانایەکی تر، ئەوەی هەیانەو دەیڵێن ئەگەر تەمەنێکی درێژیشی نەبێت و داهێنانێکی ئەدەبی قووڵیشی لەدوا نەبێت، بەڵام هەست و سۆزیان بەجیدی وەردەگیردرێت، جۆرێک لەناسینەوەیان پێدەبەخشرێت. لێرەدا خوودی بڵاوکردنەوە پەیوەندی بەناسین و شووناس و هەروەها هەستکردنی چوونە ریزی گەورە ئەدیبانەوە هەیە. پێموایە، ئەگەر هەنار بەردەوامی خۆی زیاتر (سەربەخۆیی و سروشتێتی خۆی) پیشانبدات و گوێڕایەڵی ئەو نووسەرە گەنج و غەریب و نەناسراوانە بێت کە شیاوی گوێ لێگرتنن، ئەوا دەتوانێت شوێنی خۆی زیاتریش لەوەدابین بکات کە هەستی پێدەکرێ لەوەی هەیە. لەگەڵ ئەمەشدا، کە ئەمە دەڵێم گۆڤاری هەنار وەکو جۆرە گۆڤارێکی جیاواز خۆی لەسروشتی ئەو گۆڤارانە جیابکاتەوە، کە ریزی گەنجان و غەریبان بەتەواوەتی ناگرن، رەنگە ئەمە بمانباتەوە سەرباسی گەندەڵی سیاسی و ئابووری و ئەمەو ئەوە، دیارە ئەمەش گەندەڵی ئەدەبیەو بەئاسانی هەستی پێدەکرێت لەدونیای رۆشنبیری ئێمەدا. گۆڤاری هەناریش، دەبێت خۆی لەو ڤایرۆسانە بەدوور بگرێت و بزانێت چۆن مامەڵە لەگەڵ مرۆڤایەتی بوونی ئەو گەنج و غەریبانە دەکات کە هەست بەپەراوێزی بوونی خۆیان دەکەن، هەروەها هەمیشە خۆی لەبەردەم فێربوونی

ئیتیکی نووسیندا ببینێت نەوەک نووسەردا. فێربوونی رێزگرتن و تەبایی بوون و ناسینەوەی بەرامبەر، پرۆسەیەو دەبێت فێری ببین، ئەوەش دەبێت فێری ئەو ئیتیک و دابوونەریتەمان بکات رێزی بەرهەمی ئەدەبی لەسەرو ناسین و نەناسینی نووسەرەکانەوە دابنێین و تەماشا بکەین. بەڕای من، گۆڤاری هەنار دەیەوێت کاری جدی بکات، وەلەم ئاستەوە جێگەی ستایشکردنەو هیوای تەمەن درێژی بۆدەخوازم، هەروەها تەمەندرێژی و ستایشکردنیشی بۆخۆی پابەندە بەوەی چۆن چۆنی زیاتر خۆی باشتردەکات و دەیەوێت زیاتر خۆی وەکو گۆڤارێکی کۆالیتی بەرز بەخوێنەرانی خۆی بناسێنێت.



**مەریوان هەڵەبجەیی: (هەنار) کاری جوانی کردووە، لەوەی دەروازەیەک بووە بۆ بەرهەمی لاوان و لەم رووەوە کە زۆر گرنگە، جێگادەستی دیارە**

دەستخۆشی لەبەڕێوەبەرانی گۆڤاری (هەنار) دەکەم کەحەوت ساڵە ماندوونەناسانە بەردەوامن لە دەرکردنی گۆڤارەکەیان و خزمەتێکی باشیان بەکولتووری کوردی کردووە. هیوادارم لە ئایندەشدا باشتر بتوانن خزمەت بکەن، بەڵام گەربمەوێت زۆر بەخێرایی تێبینی خۆم بخەمە ڕوو لەسەر گۆڤارەکە، دەبێت بڵێم بەداخەوە ئەو گۆڤارە جوانەش بەدەر نییە لەو کەموکوڕییەی لەزۆربەی گۆڤار و هەفتەنامە ئەدەبییەکانی ترماندا هەیە. بۆ نموونە ستراتیژێکی زۆر روون و بەرچاوی نییە لە کارکردنیداو گشتێتییەک بە رەوتی کارکردنییەوە دیارە. ئەمەش وەک کەموکوڕییەکی دەبینم. پاشان دەبێت گۆڤارەکە باشتر ئاراستەی خۆی دیاریی بکات. باشترە واز لەوەبهێنێت لە بابەتی ئەدەبی و هزرییەوە بڵاوی بکاتەوە تا دەگات بە بەشەکانی هونەر و گۆرانی... باشتر وایە خۆی تایبتمەند بکات. باشترە فلتەرەکانی لە هەموو ئاستەکاندا بەهێزتر بکات و خۆی جیابکاتەوە لەو لێشاوی بڵاوکردنەوەیەی لە بڵاوکراوەکانی تردا دەیبینین. چ لە بڵاوکردنەوەی شیعر و چیرۆک و وتار تا دەگاتە وەرگێران کە بەداخەوە زۆرجار دیومە وەرگێرانی زۆر پڕ لە هەڵەی تیا بڵاودەکرێتەوە و من ئەمەش بە زیانێکی کولتوری گەورە دەزانم. (هەنار) کاری جوانی کردووە، لەوەی دەروازەیەک بووە بۆ بەرهەمی لاوان و لەم رووەوە کە زۆر گرنگە، جێگادەستی دیارە، بەڵام وەک لە سەرەتاوە ئاماژەم پێکرد، یەکەم ئامانجی گرنگ و بونیادی هەر بڵاوکراوەیەک ئەوەیە کە ستراتیژ و ئاراستەی کارکردنی روون بێت و بەتەواوی کارەکان و ئامانجەکانی خۆی دەستنیشانکردبێت، نەک بکەوێتە ناو کاری گشتگیرییەوە و خاوەن گوتارێکی گشتگیرانە بێت.دونیای ئەمڕۆ دونیایەکی تەواو پسپۆڕانە و تایبەتمەندەو هەر رۆژ زیاتریش بەو ئاراستەیەدا دەڕوات. هیوادارم گۆڤاری (هەنار)ی ئازیزیش لەگەڵ پێ خستنە ناو تەمەنی هەشت ساڵەیەوە بەرەو ئەو ئاراستەیە بڕوات و هیوای بەردەوامی و سەرکەوتن بۆ ستافە ئازیزەکەی دەخوازم.



## ناڵە حەسەن: گۆڤاری (هەنار) ماڵێکی ئارام بۆ داهێنان

خۆم بە بەختەوەر دەبینم کە لەم سەفەری نووسین و داهێنانەمدا، لە ماڵە جوانەکەی (هەنار) شوێنێکم هەیە بۆ حەسانەوە و لەوێوە بینین و روانگەکانی خۆم بۆ ژیان و بۆ بوون و مردن و جوانی دەخەمەڕوو. بەختەوەرم بەوەی ئەم ماڵە رەنگینەمان لەنێو شەوەزەنگی مەعریفە و داهێناندا ساڵ لەدوای ساڵ مۆمەکانی خۆی دادەگیرسێنێ... ئەم ماڵە رەنگین و دڵگیرەمان، هەوارگەیەکی ئارامە بۆ هەموومان. پیرۆزبێت داگیرساندنی هەشتەمین مۆم، بە ئومێدم ئەستێرە گەشەکانی تەمەن لە ئاسمانەکەی ئەم ماڵە هەر بدرەوشێتەوە، لە پێناو بەها جوانەکانی داهێنان و مرۆڤایەتی و ژیان.



**نەجات حەمید: بۆ ئەمڕۆ مانەوەی ئەو گۆڤارە لە دنیای رۆشنبیریی کوردیدا گرنگیی خۆی هەیە.**

مانەوە و بەردەوامبوونی گۆڤاری (هەنار) دەربڕینی لە خۆشەویستی و دەست پاکیی مرۆڤێکی ئەدیب کرد کە توانی بە پێداویستییەکی زۆر کەمەوە بەردەوام بێ لە سەر دەرکردنی، کە ئەویش محەمەد کوردۆی شاعیرە، لەوساوە تاکو ئێستا ئەو گۆڤارە هەموو ژمارەیەکی بە رێکوپێکی و بە بابەتی بە پێزەوە دەخاتە بەردەم خوێندەواران، بۆ ئەمڕۆکەش مانەوەی ئەو گۆڤارە لە دنیای رۆشنبیریی کوردیدا گرنگیی خۆی هەیەو هەنار ئەو گۆڤارەیە کە هەمیشە دەرگاکانی لە بەردەم نووسەران و رۆشنبیران کراوە بووە بە بێ ئەوەی هیچ جیاوازیەک لە نێوان نووسەرانی کوردستاندا بکات کە ئەمەش هەموو کات مایەی دڵخۆشیی نووسەران بووە بەوەی ئەوەتانێ گۆڤارێک لە کوردستاندا هەیە کە بایەخ بە ئەدەب و رۆشنبیریی کوردی دەداو بە کوردیەکی رێکوپێک و بێ هەڵەنووسینی نووسەران بڵاودەکاتەوە، لەو باوەڕەدام پشتیوانیکردن لەو گۆڤارە، چ لەلایەن وەزارەتی رۆشنبیری و چ لەلایەن رۆشنبیرانەوە خزمەتێکی راستەقینە دەبێت بە رۆشنبیری کوردی، هیوای بەردەوامی و سەرکەوتن بۆ ستافی گۆڤارەکە دەخوازم و دەست خۆشیان لێ دەکەم.



## هونەرمەند نەرمین ئەحمەد کوانی: کاتێک کە ئەم گۆڤارە بەردەستت دەکەوێت هەست دەکەیت بە ئەندازەی کتێبێک زانیاری و سوودت پێدەگەیەنێت

گۆڤاری (هەنار) وەکو گۆڤارێکی ئەم سەردەمە دەتوانم بڵێم گۆڤارێکی هونەری ئەدەبی راستەقینەیە، تایبەتمەندیی خۆی هەیە کە جیای دەکاتەوە لە گۆڤارەکانی تر ئەویش بەوەی کە گرنگی بەچەند شتێک دەدات کە هەریەکەیانی لەوی تر جیاکردووەتەوە، لەگەڵ ئەوەی کە دیدار لەگەڵ هونەرمەندان سازدەکات، کە ئەمەش شایەنی دەستخۆشییە، کاتێک کە ئەم گۆڤارە بەردەستت دەکەوێت هەست دەکەیت بە ئەندازەی کتێبێک زانیاری و سوودت پێدەگەیەنێت هەر لەبابەتی وەرگێران و ئەدەبی و چەندین بابەتی هونەری بەسوودی تر، بۆیە لێرەوە دەستخۆشیتان لێدەکەم و بەهیوام بابەتەکانیان بەپێزتر بکەن و خزمەتی زیاتر بە ئەدەب و هونەری کوردی بکەن.

لە (هەنار)ی ژمارە (٣٦)ی ساڵی ٢٠٠٩-ەوە وەرگیراوە.



## ساڵح سوزەنی: هەنار گۆڤارێکی جیددییە

لامواپە «هەنار گۆڤارێکی جیددییەو هەر لەناوە شاعیرانە و رەمزییەکەیەوە (ئاماژە بە سیستمێکی هونەرییانەی خۆش رەنگی پێکهاتەمەند) تا رووبەرگی نوێ و بابەتگەلی تازەو... شایانی ئەوەی هەیە بە هەر لەونێک بەدەست شاعیران، نووسەران، رەخنەگران و رووناکبیرانی کورد بگات و بەرهەمی نوخبەی تێدا بڵاوبکرێتەوە و ببێتە ئومێد بۆ خۆیان و خوێنەرانی چالاکی بواری رۆژنامەگەری و رووناکبیریی کوردی.

لە (هەنار)ی ژمارە (٣٦)ی ساڵی ٢٠٠٩-ەوە وەرگیراوە.



## سەلاح حەسەن پاڵەوان: هەنار، بەشدار بوو لە دووبارە هەڵوەشاندنەوەی تێرمی کلاسیکیانەی گۆڤار

گۆڤاری هەنار لەو تەمەنەی خۆیدا تام و چێژێکی تایبەتی بەخشییە خوێنەران و ئەو نووسەرانەی کە کەم تا زۆر بەشداریان لە درێژبوونەوەی لق و پۆپەکانی کرد. هەنار تەنیا گۆڤارێ نەبووە بۆ تام و چێژشکاندنی خوێنەران، بگرە بەشدار بوو لە دووبارە هەڵوەشاندنەوەی تێرمی کلاسیکیانەی گۆڤار، بەڵام هەندێ گرفتی تەقلیدیانە تا ئێستەش بەرۆکی بەرنەداوە. ئەم گۆڤارە بەشداربوو لە پێگەیاندن و واڵاکردنی هەندێ دەنگی تایبەت کە خوێنەران تەنیا لەو ڕێگایانەوە دەتوانن بیاندۆزنەوە، هەرچەندە لە شاری سلێمانی دەردەچوو، بەڵام تاموچێژی هەموو شارەکانی پێوە بوو. لە ڕێی تێکستەکانییەوە ساتە جوانەکانی پێناساندین و لەو ڕێڕەوەی کە گرتبووی پسپۆری خۆی پاراستبوو. هەنار سەرباری گرفتە بچووکەکانی، گەر بیەوێ دەتوانێ لەسەر ئاستی گشتی سنووری جوگرافی شارەکان ببەزێنێ.



## سەردار عەزیز: گۆڤاری (هەنار)، پانتاییەکە بۆ هونەر و ئەدەبی، لە شارێکدا کە دەخوازێت ئەم شێوازانەی دەربڕین بکاتە کرۆکی شوناسی

دەربارەی گۆڤاری (هەنار) من دوو دیدم هەیە، یەکەم وەک گۆڤارێکی ئەدەبی و هونەری، دووەم وەک گۆڤاری (هەنار). لەڕووی دیدی یەکەمەوە، هەموو کۆمەڵگایەک گەر ژیاری مرۆڤانە بەلایەوە جێگای بایەخ بێت، ئەوا هونەر و ئەدەب پێگەیەکی باڵایان دەبێت تیایدا.

دیارە، هونەر و ئەدەب رۆڵیان زۆرە، لەڕووی تاکەکەسی، کۆمەڵایەتی و سیاسییەوە، بەڵام لەسەررووی هەموویەوە هونەر و ئەدەب پانتاییەکی راستەقینەن بۆ ئەنجامدانی کارێک کە مرۆڤ پێی نامۆ نییە. لێرەدا من دیدێکی مارکسییانەم هەیە، لای مارکس هونەر و ئەدەب تەنها شێوازی کارن کە بە مرۆڤ نامۆ نین، وە لەمیانەی ئەنجامدانیاندا، مرۆڤەکان هەست بە چێژ و ئازادی و دەربڕین و پەیوەندیکردن و ئامادەبوون دەکەن. بەمپێیە کۆمەڵگایەک گەر بایەخ بدات بە تاک، بە ئازادی، بە دەربڕین، بە جوانی، بە تێگەیشتن لە مرۆڤ و نهێنییەکانی، ئەوا دەبێت پانتایی هونەر و ئەدەب تیایدا تا ئەوپەڕی فراوان بێت. ئەمە جودایە لە دیدی سەرمایەداری بۆ هونەر کە هونەر تیایدا وەک دەربڕێک تەماشا ناکرێت، بەڵکو بە پێوەرەکانی بازاڕ دەپێورێت. بۆیە لە دونیای سەرمایەدارییدا کرچوکاڵ بەبایەخە و هونەری جیدی پەراوێزە.

بەم پێیە گۆڤاری (هەنار) پانتاییەکە بۆ هونەر و ئەدەبی لە شارێکدا کە دەخوازێت ئەم شێوازانەی دەربڕین بکاتە کرۆکی شوناسی. هەنار، دیارە گەر بە وردی و لەڕووی تەکنیکییەوە، کە بەڕای من لێی بنواڕیت رەنگە پێویستی بە گەشەپێدان هەبێت، ئەمە بۆ هەموو گۆڤار و رۆژنامە و هەموو شتێک راستە، چونکە رەخساندنی پانتاییەک بۆ ئەدەب و هونەر لە هەمانکاتدا پێویستی بەوەیە لەگەڵ گەشەی هونەر و ئەدەبدا گەشە بکات. گەر هونەر و ئەدەب دەربڕی مرۆڤبن بۆ خۆی و دونیاکەی لە باڵاترین شێوازدا، ئەوا دەبێت لە هەمانکاتدا ئەو پانتاییەی کە دەرەخسێت بۆ ئەم بوارانە، هەوڵی ئەوە بدات کە لە باڵاترینیدا بێت.



## سەباح ڕەنجدەر: جوانترین کار و بەرهەمی وەزارەتی ڕۆشنبیری حکومەتی هەرێمی کوردستان، گۆڤاری (هەنار)ە.

بە بێ هیچ جیاوازییەک هەموو ئەو ڕۆژنامە و گۆڤارانە دەخوێنمەوە، کە بابەتی ئەدەبییان تێدا بڵاودەکرێتەوە، هەندێکیان دوای چاوپێداخشان و خوێندنەوە، بەلاوە دەنێم، چونکە دەزانم جارێکی تر پێویستم پێی نابێتەوە و ناگەڕێمەوە سەریان. هەندێکیشیان لە کتێبخانەکەم دەپارێزم، (هەنار) یەک لەو گۆڤارە بەنرخانەیە، لە کتێبخانەکەمدا خانەیەکی تایبەتیم بۆ تەرخانکردووە و هەموو ژمارەکانم پاراستووە. هەندێک جار گرفتی دابەشکردن پەیدا دەبێت، ناگاتە هەولێر. ناچار ڕوو لە برای میهرەبانم (تەیب جەبار) دەنێم بۆمی دەنێرێت، منەتباریم.

بەلای منەوە دوای پرۆژەی دروستکردنی قوتابخانە و زانکۆکان، جوانترین کار و بەرهەمی حکومەتی نیشتمانی ئەوەیە، بایەخ بە ئەدەب و زمان بدات، لە ئێستادا جوانترین کار و بەرهەمی وەزارەتی ڕۆشنبیری حکومەتی هەرێمی کوردستان، گۆڤاری (هەنار)ە.

تێبینییەک و دوو پێشنیارم هەیە ئەگەر شیاوی قبووڵکردن بێت:

- وەک نەریتێک لەسەر بەرگی هەموو ژمارەیەک، وێنەی دوو نووسەر دادەنرێت. زۆربەی وێنەکان نووسەرە بیانییەکانن، بەو هیوایەم لەمەودوا وێنەکان وێنەی نووسەرانی کورد بن.

- گۆڤارەکە وەک تایبەتمەندییەک ڕوو لە نووسەرە بەئەزموونەکانی خۆمان بنێت، هەر ژمارەی یەکێکیان ئەزموونی ئەدەبی خۆی بنووسێتەوە تا بۆ وەچەی نوێ ببێتە وێستگەیەک و ببێتە نەریتێکیش لە ناوەندی ڕۆشنبیریی کوردیدا.

- گۆشەیەک بەسەر ناوی (دەقی دوێنێ) تەرخان بکات بۆ ئەو دەقە داهێندراوانەی کە سیساڵ بەسەر نووسین و بڵاوکردنەوەیان تێپەڕیوە، دووبارە بڵاویان بکاتەوە. پێشنیاریش دەکەم لەم دوو دەقەوە دەست پێ بکەن: (وەرزی سەرهەڵدانی فەرهاد)ی ئەنوەر قادر محەمەد و (ئامێردەکان)ی محەمەد موکری. بەهیوام لەو وەرزەدا مەشخەڵی گۆڤارەکە ڕووناکتر بێت.



## هونەرمەند ستار قادر: هەنار هەر زوو جێی خۆی کردەوە

لە ساڵیادی گۆڤاری (هەنار)ی ئازیزدا پیرۆزبایی لەو ستافە ماندوونەناسە دەکەم کە هەموو مانگێک لە کاتی خۆیدا و بەوپەڕی دڵسۆزییەوە دەریدەکەن، ئەوەی جێی سەرنجە گۆڤاری (هەنار) لە بەرامبەر گۆڤارەکانی تری بواری رۆشنبیریماندا تەمەنی کەمترە.

بەڵام هەرزوو جێگەی خۆی کردەوە لە رووبەرە رۆشنبیرییەکەیدا، ئەوەندەی پەیوەست بێت بە بواری شێوەکارییەوە گۆڤاری (هەنار) درێغی نەکردووە، لەم رووە و رۆشنبیرییەکی شێوەکاری بە خوێنەرانی داوە، دەستخۆشی لە ستافی گۆڤاری (هەنار) بێت.

لە (هەنار)ی ژمارە (٣٦)ی ساڵی ٢٠٠٩-ەوە وەرگیراوە.



## د. عادل گەرمیانی: گۆڤاری هەنار توانیوویەتی ناودارییێک بۆ خۆی تۆمار بکات

تەمەن درێژی نەک تەنیا بۆ مرۆڤ سوود بەخشە، بەڵکو بۆ هەموو گۆڤار و رۆژنامەیەکیش سوودی خۆی هەیە، چونکە باشترین بەڵگەیە بۆ زۆری ئەزموون، کەوا دەبنە مایەی زیاتر پێگەیشتن و پەرەپێدانیان لەبواری کارو کردەوەی رۆژنامەنووسیدا. دەرچوونی گۆڤاری هەناریش بۆ (٩) ساڵ دەلالەتێکی تەمەن درێژی ئەم گۆڤارە نازدارەیە .

لەڕاستیدا هەنار تامێکی مزر یان خۆشی خۆی هەیەو هەناری شەهرەبان و هەناری عەبابەیلێ وەک دەڵێن بەتامترین هەنارە لە وڵاتەکەماندا، بەڵام لای من هەناری گۆڤاری هەنار لەهەموو جۆرەکانی هەنار بەتامترو سوودبەخشترە، چونکە لەهەموو وەرزەکانی ساڵ دەستمان دەکەوێت و ئەوەی تێیدا بڵاودەکرێتەوە باشترین زاخاوە بۆ مێشکمان، تەنانەت ئەگەر هەناری میوە دوای خواردنی توێکڵەکەی فڕێ دەدرێت، ئەوا هەناری گۆڤار لەنێو کتێبخانەکانمادا بەخۆی و بەرگەکەی بە ناسکی هەڵیدەگرین و دەیپارێزین .

کەمن ئەو رۆژنامەو گۆڤارە کوردییانەی توانیوویانە مانەوەی خۆیان بپارێزن و ساڵانی تەمەنیان زیاتر رابگرن، گۆڤاری هەناریش یەکێکە لەو گۆڤارە تام خۆش و تەمەن دەرەوشاوەی پڕ لە رۆشنبیری و ئەدەبییە، کەوا توانیوویەتی ناودارییێک بۆ خۆی تۆمار بکات لەم رۆژگارەی گۆڤاری ئەلیکترۆنی، کە زۆر بە گەرمی پێشبرکێی مەعریفیی بەرفراوان لەگەڵ گۆڤارە کاغەزییەکاندا دەکەن. ئەم مانەوەی گۆڤاری هەنارو بوونی بە خاوەن ناوبانگیی خۆی بەلامەوە بۆ ئەم خاڵانەی خوارەوە دەگەڕێتەوە:

١- دڵسۆزی سەرجەم کارمەندانی گۆڤارەکە لە کاروبارەکارنیاندا تا بەڕێکوپێکی

لە کاتی خۆیدا بەشێوەیەکی مانگانە دەربچێت .
٢- غەمخۆری سەرنووسەرەکەی و دەستەی نووسەرانی بۆ پاراستنی ناوبانگیی گۆڤارەکە لە ساڵەکانی تەمەنیدا .
٣- جوانیی شێوەی دەرچوونی لەڕووی هونەرییەوە، بەشێوەیەک لەسەر بەرگی هەر ژمارەیەکی تابلۆیەکی شێوەکاری جوان هەبوونی کاریگەری خۆی هەیە لەڕووی مەعریفییەوە، هەروەها دیزاینی سەرجەم لاپەڕەکانی گۆڤارەکە تا رادەیەکی باش جوانی خۆی هەیە .
٤- دابەشکردنی ژمارەی لاپەڕەکانی هەر ژمارەیەک، بەشێوەیەک هەموو بوارەکانی مەعریفەی تێدایە وەکو: شیعر – چیرۆک –ڕەخنەی ئەدەبی – لێکۆڵینەوە – سینەما – وەرگێڕان – شیوەکاری ... هتد.
٥- بایەخدان بە ئەدەب و رۆشنبیریی بیانی لەتەک بایەخدان بە ئەدەب و رۆشنبیریی کوردیی خۆماڵی، ئەمەش لەپێناو زیاتر فراوانکردنی ئاستی مەعریفیی و رۆشنبیری خوێنەرانە .
وەک خوێنەرێکی بەردەوامی گۆڤاری هەنار، هەروەها وەک نووسەرێکی بەشداربوو لە هەندێ لە ژمارەکانی لە ماوەی نۆ ساڵی تەمەنی ئەم گۆڤارە نازدارەدا هەندێ باری سەرنجم هەیە هیوادارم بەسنگ فراوانی لێم قەبووڵی بکەن:
١- خۆزگە سەروتاری گۆڤارەکە هەرجارێ نووسەرێک بینووسێت بۆ ئەوەی زیاتر دیدی جیاوازی نووسەرانمان بۆ دەربکەوێت .
٢- خۆزگە دوا لاپەڕەی گۆڤارەکە بکرێتە سەکۆیەک هەرجارێ نووسەرێک بینووسێت، چونکە جیاوازی بیروڕاکان دەبێتە زیاتر مایەی سەرنجڕاکێشی خوێنەرانی گۆڤارەکە .
٣- بەرگی گۆڤارەکە بۆ یەک ساڵ بە یەک شێوە دەرنەچێت و تەنیا رەنگەکە بگوڕدرێت، بەڵکو هەر ژمارەیەک خاوەنی بەرگی تایبەتی خۆی بێت، وابزانم ئەم کارە زۆر زەحمەت نییە، چونکە ژمارەی ئەوانەی خاوەن هونەری دیزانی بەرگی کتێب و گۆڤارەکانن لە زیادبووندایە .
٤- بێگومان چارەسەرکردنی گرفتی پەخش و بڵاوکردنی ژمارەکانی گۆڤارەکە بەسەر کتێبخانەکانی ناو شارو شارۆچکەکان دەبێتە هۆی زیاتربوونی ژمارەی خوێنەرانی ئەم گۆڤارە ئازیزە.
٥- تەرخانکردنی چەند لاپەڕەیەکی گۆڤارەکە بۆ تەوەرێک بەناونیشانی دەق و رەخنە، یان تابلۆو رەخنە کارێکی مەعریفیی سوودمەند دەبێت .

٦- مانەوەی قەوارەی گۆڤارەکە وەکو خۆی کارێکی زۆر باشە، چونکە مامناوەندە لەنێوان کتێبی گیرفان و کتێبی گەورە.

٧- راسپاردنی رەخنەگران بۆ نووسینی بابەتی رەخنەیی لەبارەی ئەو کتێبانەی دەردەچن لەلایەن هەمان دەزگای دەرچوونی گۆڤاری هەنارەوە کارێکی مەعریفی و رەخنەیی و راگەیاندنی باش دەبێت.

٨- خۆزگە لەتەک نووسەری بابەتەکان وێنە و ئیمێڵ و پرۆفایلی نووسەرەکەش بڵاوبکرێتەوە بۆ زیاتر ئاشنابوونی خوێنەران بەو نووسەرانە .

٩- نرخی گۆڤارەکە کە هەزارە، کارێکی باشە بۆ زیاتر فرۆشتنی گۆڤارەکە .

١٠- ئەو لاپەڕانەی لەسەرەتای هەر تەوەرێکی گۆڤارەکە لابدرێت کارێکی باش دەبێت، چونکە لەنێو پێڕستی گۆڤارەکە تۆمارکراون و ئەو پێنج یان شەش لاپەڕەیە دەتوانن جێگاخۆش بکەن بۆ بڵاوکردنەوەی بابەتێکی تازە لەنێو گۆڤارەکە .

١١- هەندێ بابەت لە سایتەکان بڵاودەکرێنەوەو زۆربەمان بێ ئاگاین لێیان، خۆزگە تەوەرێکیان بۆ تەرخان بکرێت بەناونیشانی (بۆم هەڵبژاردی لە سایتەکانەوە).

لە کۆتاییدا هیوادارم ئەم گۆڤارە هەنار شیرینەمان هەر بەردەوامبێت لە دەرچووندا، چونکە بەهۆی ئەم گۆڤارە لە هەموو مانگەکانی ساڵدا لە تامی مزرو شیرینی هەناری مەعریفی بێ بەش نابین و هیوای سەرکەوتنیش بۆ سەرنووسەری گۆڤارەکەو سەرجەم دەستەی نووسەرانی و کارگێڕانی دەخوازم .



## عەبدولموتەڵیب عەبدوڵڵا: توانای ئەوەم نییە، شتێک بە دڵی خۆم و شایستە بەگۆڤاری هەنار بنووسم، چەشنی ئەو رەنگاوڕەنگ و پڕ تام و چێژ بێت

عەبدولموتەڵیب عەبدوڵڵا: توانای ئەوەم نییە، شتێک بە دڵی خۆم و شایستە بەگۆڤاری هەنار بنووسم، چەشنی ئەو رەنگاوڕەنگ و پڕ تام و چێژە بێت

هیوام سەرکەوتنتانە، بە داخەوە هەست دەکەم وەک پێویست توانای ئەوەم نییە، شتێک بە دڵی خۆم و شایستە بەگۆڤاری هەنار بنووسم، چەشنی ئەو رەنگاوڕەنگ و پڕ تام و چێژ بێ، ئەو ماوەیە بێ تاقەتی رووی تێکردووم، جگە لە خوێندنەوە توانای نووسینم نییە، تکایە ئەو شیعرەی خۆمتان بۆ دەنێرم ئەگەر بە دڵتان بێ و بتوانێ بەشداری لە هەنارە نایابەکەتاندا بکات، بەشێک لەو بێ تاقەتیەم کەم دەبێتەوە.



## عەبدوڵڵا قادر دانساز: بێگومان (هەنار) ڕۆڵی باشی بینیوەو هیواداریشم بەردەوامبێت لەسەر ئەو ڕێچکەیەی لە سەرەتاوە گرتوویەتییەبەر

من گۆڤاری (هەنار) بە یەکێک لە گۆڤارە سەرکەوتووەکان دادەنێم و بەردەوامیش لەسەر ئینتەرنێت بەرهەمەکانی نێوی دەخوێنمەوە. وەکو شێوەی مۆنتاژ و دیزاینی گۆڤارەکە زۆر جوانە و سەرنجی خوێنەر رادەکێشێت. من لەو باوەڕەدام بەشێکی زۆر گرنگی بڵاوکراوە مۆنتاژ و دیزانی بڵاوکراوەکە دەبینێت، هەرچەندە ئەو بەشەیان ئەوەندە باسی لێوە ناکرێت.

بێگومان (هەنار) رۆڵی باشی بینیوەو هیواداریشم بەردەوامبێت لەسەر ئەو رێچکەیەی لە سەرەتاوە گرتوویەتییەبەر و هەر ئەمەشە وایکردووە زۆر لە نووسەرە باشەکان بەردەوام بەرهەمیان لەوێدا بڵاوبکرێتەوە. هەرچەندە هەندێجار بەرهەمی کرچ و کاڵ دەکەوێتە نێو گۆڤارەکەوە، ئەوەیان نابێتە هۆی ئەوەی لە نرخی گۆڤارەکە کەمبێتەوە.

خاڵە پۆزەتیڤەکانی هەنار ئەوەیە: بەردەوام لە کاتی خۆیدا دێتە بازاڕو دەچێتە سەر ئینتەرنێت، ئەمەش وادەکات ئەو کەسانەی مەبەستیان خوێندنەوەی گۆڤارەکەیە، بەردەوام بتوانن لەکاتی خۆیدا بیخوێننەوە.

لە (هەنار)ی ژمارە (٣٦)ی ساڵی ٢٠٠٩-ەوە وەرگیراوە.



## هونەرمەند عەبدولی حەمەجوان: من (هەنار) وەک گۆڤارێکی سەنگین دەبینم لەناو گۆڤارە کوردییەکاندا

کە دەست دەدەیتە گۆڤارەکە لە یەکەم بابەتەوە تا کۆتایی وا سەرنجت رادەکێشێت کە دەبێت بیخوێنیتەوە، تەوەری باسەکانی گشتگیرە کە وا لە خوێنەر دەکات ئالوودەی ببێت، سەرەڕای ئەوەش دەتوانێت گەنجینەی مەعریفی خۆتی تێدا بدۆزیتەوە و سوودی لێوەرگریت، جگە لەوەی ئەو کەسانەی کەوا دیداریان لەگەڵدا دەکرێت بابەتەکانیان وەک خۆی دەخرێتەوە بەرچاو و دەشێت هەندێکجار لەڕووی ئەدەبییەوە جوانکاریی تێدا بکرێت بۆ گرنگیی ئەو باسانە، من (هەنار) وەک گۆڤارێکی سەنگین دەبینم لەناو گۆڤارە کوردییەکاندا، هیوادارم ئەم یادە تەنیا یادکردنەوە نەبێت، بەڵکو بەردەوامیی و کارکردن بێت.

لە (هەنار)ی ژمارە (٣٦)ی ساڵی ٢٠٠٩-ەوە وەرگیراوە.



# فارووق هۆمەر: هەنار، یەکەمین گۆڤاری کوردییە کە زۆرترین بابەتی بخوێنمەوە

گۆڤاری (هەنار) ئەو گۆڤارە بوو کە لە ماوەیەکی زۆر کورتدا توانی هەنگاوی زۆر گەورە بنێت.

ئەگەرچی من (هەنار)م لەڕێی تۆڕی ئینتەرنێتەوە بینیوە، بەڵام خۆشبەختانە ئەو هەلەم بۆ هەڵکەوتووە کە هەموو ژمارەکانی ببینم، لە ژمارە یەکەوە تا بەدوایین ژمارەی دەگات.

ناڵێم هەموو بابەتەکانیم خوێندۆتەوە، بەڵام یەکەمین گۆڤاری کوردییە کە زۆرترین بابەتی بخوێنمەوە. کە یەکەم ژمارەی (هەنار)م بینی لە وەزارەتی رۆشنبیرییەوە دەردەچێت گەلێک ئاسودە بووم بەوەی کە (هەنار) دەبێتە دەرووەیەک بۆ ئەوەی رۆشنبیری کورد لە قەیدو شەرتی پارت و حزبی سیاسی قوتار بکات و دەروازەیەکیش بێت بۆ ئەدەب و هونەری ئازاد و سەربەخۆ و جیاواز لەو رۆژنامە و گۆڤارانەی دی کە ناوی ئازادیان لەخۆ ناوە و لەلایەن ئەندام مەکتەب و ئەندام سیاسی حزبەکانەوە دەبرێن بەڕێوە، هەناسەیەک بە بەر دواڕۆژی رۆژنامەگەری کوردیدا بێنێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا ترسام کە وەک زۆر خەونی دی کە هەر بە نەمامیی، یان بەلاوی سەربنێتەوە. من هەمیشە و بەردەوام دەستم لەسەر دڵم داناوە و ئەو کاتەی کە ژمارەیەکی تازەی هەنار دەگاتە جێ ئەوجا ئۆخەی دەکەم. ئاسان نەبوو لەنێو ئەو هەموو گۆڤار و رۆژنامانەدا کە دەزگایەکی حزبی لەپشتییەوەن و پاڵپشتی ماڵی گەورە دەکرێن، گۆڤارێک لە کەنارەوە هەناسە بدات، دەستتان دەگوشم و (هەنار) بە جگەرگۆشەی خۆم دەزانم.

من دڵنیاتان دەکەم کە هەموو ژمارەکانی گۆڤاری (هەنار) گەواهی سەرکەوتنی ئێوە دەدات. بۆیە کارەکەتان بە بەرز و شیاو دەزانم و من وەک خوێنەرێک گەواهی ئەوە دەدەم.

لە (هەنار)ی ژمارە (٣٦)ی ساڵی ٢٠٠٩-ەوە وەرگیراوە.



## فەرهاد شاکەلی: گۆڤاری هەنار لە ڕووی ناوەڕۆکەوە تا ڕادەیەک سەرکەوتووە

گۆڤاری چاک، ئەگەر بکرێ چەمکێکی وەها بەکار ببرێت!، ئەوەیە کە لە ژیانی فەرهەنگیی نەتەوەیەکدا، یا کۆمەڵێکدا، کارکردێکی وەها قووڵی هەبێت کە ببێتە هۆی ڕەنگرێژکردنی لایەنێکی ئەو فەرهەنگ و کۆمەڵە؛ لە مێژووی فکری و فەرهەنگیی وڵاتێکدا هێندە کاریگەر بێت، کە نەوەیەکی خوێنەوار، نەوەیەکی ڕووناکبیری بە ناوەوە ناو بنرێت. ئەمەیان وا پێ دەچێت نەخشێک بێت، تەنیا بە تێپەڕینی زەمان دەربکەوێت، چونکە تا ڕووداوەکان نەبنە مێژوو، شەکڵ و تەشکی تەواوی خۆیان وەرناگرن. بەڵام وایش نییە. هەر لە سەردەمی خۆیشیدا ئەو گەشەکردنەی بەرەو «بەمێژووبوون» دەڕوات هەستی پێ دەکرێت و دەبینرێت.

لە مێژووی فەرهەنگی کورددا گۆڤارێکی وەک «گەلاوێژ» (١٩٣٩-١٩٤٩) لەو بابەتە بوو. خۆ گەلاوێژ نە جوان بوو، نە ڕێکوپێک بوو، نە گۆڤارێکی فکری بوو، بەڵام بەشێکی لە مێژووی فەرهەنگی کورد داگیر کردووە. گەلاوێژ نەبووایە چیرۆکی کوردی لە پەنجاکان و شەستەکاندا پێش نەدەکەوت. گەلاوێژ نەبووایە زمانی کوردی ئەمڕۆ کێشەی زۆرتری دەبوو.

گۆڤاری هەنار لە ڕووی ناوەڕۆکەوە تا ڕادەیەک سەرکەوتووە. لە ڕووی هونەرییەوە، دیزاینی لاپەڕەکان، دەمێکە لە سنوورێکدا وەستاوە و نەچووەتە پێشێ.

لە (هەنار)ی ژمارە (٣٦)ی ساڵی ٢٠٠٩-ەوە وەرگیراوە.



**ڕێوار سیوەیلی: هەنار، لەسەردەمێکدا بەرهەمهێنانی ئەدەبی و داهێنانی بەرهەمە خەیاڵییەکانی بەبیری ئێمە هێنایەوە، کە بەشێکی زۆرمان ببووینە نووسەری سیاسی**

پێشئەوەی سەرنجی خۆمتان لەبارەی گۆڤاری هەنارەوە عەرز بکەم، دەبێت سوپاسی برای ئەندازیار و شاعیر کاک تەیب جەبار بکەم، کە سەرنجی منی بۆلای گۆڤارەکەتان ڕاکێشا و چەند ژمارەیەکی کردە دیاری کتێبخانەکەم.
لەبەرئەوە تێڕوانینی گشتیی من بۆ هەنار هەتا ئێستا زۆر باشەو لەو بڕوایەشدام بتوانێت لەئێستاش زیاتر ئەدیب و نووسەران لەخۆی کۆبکاتەوە. هەنار لەسەردەمێکدا بەرهەمهێنانی ئەدەبی و داهێنانی بەرهەمە خەیاڵییەکانی بەبیری ئێمە هێنایەوە، کە بەشێکی زۆرمان ببووینە نووسەری سیاسی.
هەنار، بەبێ دروشمی پێشوەخت و هەیت و هاوار، لەو فەزایەدا هات بۆئەوەی بایەخ بۆ نەوعییەتی ئەدەبی و ئەدەبی جیدی بگێڕێتەوە. هەرچەندە هێشتا بەو ئامانجە نەگەیشتووە، بەڵام وا هەست دەکەم ڕێنماییکەرێکی باشی نەوەی نوێ بووە بۆ ناسینەوەی ئەدەبی نەوعی لە دنیایەکدا، کە هەر شتێ خۆی وەکو ئەدەب و داهێنان دەناسێنێت. هەروەها لە ئاستی ڕەخنەشدا نموونەی کاری جوانی پێشکەشکردووین و چاوەڕوانی شتی جوانتریشم، چونکە بڕوام بە گۆڤارەکەتان هەیە.
خاڵی هەرە پۆزەتیڤی هەنار بەردەوامبوون و کۆدەنگیتانە لەسەر ڕێچکەی گۆڤارەکە، ئەمەش دەیسەلمێنێت کە هێشتا شیاوە لە دنیایەکی پەرتەوازەی لەتوپەتکەردا، لەپێناوی بەهاو پڕۆژەیەکدا کە بڕوامان پێیەتی، کۆببینەوەو لەپێناویدا ڕەنج بکێشین. خاڵی نەگەتیڤی گۆڤارەکەشتان ئەوەیە کە بەرهەمتان بڵاوکردۆتەوە نووسەرەکانیان بە زمانێکی تەندوتیژو نائەدەبی وەڵامی نووسەری دیکەیان داوەتەوە.
لە (هەنار)ی ژمارە (٣٦)ی ساڵی ٢٠٠٩-وە وەرگیراوە.



**ڕۆژ هەڵەبجەیی: (هەنار)، ئەگەر هەر وا بەردەوام بێت، پێموایە کەلێنێکی گەورە لە هەژاریی کتێبخانەی کوردی پڕدەکاتەوە.**

دەتوانم بڵێم (هەنار) زۆر لە کەسایەتییە هونەریی و ئەدەبییە پەراوێزخراوەکان جارێکی تر دەهێنێتەوە بەرچاومان، ئەمەش خۆی لەخۆیدا قورساییەکی ئەو گۆڤارە دەردەخات کە جیاوازە لە گۆڤارەکانی تر، کە من ئەو گۆڤارانەی وەک (هەنار) لە پێشخستنی رۆشنبیریی و تاک و کۆمەڵ وێڕای کارە هونەرییەکان و دیدار لەگەڵ هونەرمەندان ئەوەندەی تر قەشەنگ خۆی دەنوێنێت، ئەمە جگە لە باسکردنی رووناکبیرو بیریارە مۆدێرنەکانی ئەقڵی رۆژئاوا و دیارخستنی کەلتووری گەلان، بەشێوەیەکی گشتیی (هەنار)، ئەگەر هەر وا بەردەوام بێت، پێموایە کەلێنێکی گەورە لە هەژاریی کتێبخانەی کوردی پڕدەکاتەوە.
لە (هەنار)ی ژمارە (٣٦)ی ساڵی ٢٠٠٩-ەوە وەرگیراوە.



**هونەرمەند رووناک مەحمود: پیرۆزبێت بەردەوامی و پێشکەوتنی گۆڤاری هەنار**

بەبۆنەی داگیرساندنی مۆمێکی دی پڕ بڕشتی گۆڤاری (هەنار)ی ئازیز، خۆشحاڵم پیرۆزبایی خۆم ئاراستەی هەموو ستافی گۆڤارەکە بکەم، هیوای بەردەوامی و زیاتر پێشکەوتنیان بۆ بخوازم، داواکاریشم لە بەڕێزان پەیامنێر و نووسەرانی ئەم گۆڤارە کە لایەنێکی زۆر گرنگ و کاریگەرن بۆ پێشکەوتنی هونەری کوردی و داکۆکیکردن لە هەڵوێستیان بەرامبەر هەندێک کەسی کاڵفام و دواکەوتوو، دیسانەوە پیرۆز بێت، بەردەوامی و پێشکەوتنی گۆڤاری (هەنار)ی ئازیزمان هیوا و ئاواتمانە... هەربژین.

لە (هەنار)ی ژمارە (٣٦)ی ساڵی ٢٠٠٩-ەوە وەرگیراوە.



## هونەرمەند رووبار ئەحمەد: ئەم گۆڤارە شانبەشانی سەرجەم گۆڤارەکانی تر پێویستییەکی هەنووکەییە، بۆ ئەم بارودۆخەی ئێستای کوردستان

سەرەتا بەبۆنەی گۆڤارەکەتانەوە (هەنار)، پیرۆزبایی ساڵیادی تەمەنی دەکەم و هیوای بەردەوامی بۆ دەخوازم، بۆ زیاتر خزمەتکردن بەئەدەب و کەلتوورو رووناکبیری و هونەری کوردی، بوونی ئەم گۆڤارە شانبەشانی سەرجەم گۆڤارەکانی تر پێویستییەکی هەنووکەییە، بۆ ئەم بارودۆخەی ئێستای کوردستان، چونکە مێژووی ئەدەبی جیهان ئـەوەی سـەلماند کە نووسین و بەئەرشیفکردن و تۆمارکردنی مێژوو لەڕێگەی نووسین لە گۆڤار و کتێب و تۆمارکردنەوە، پاراستنی خودی مافەکانی هەر گەل و میللەتێکە، ئەم گۆڤارە، گۆڤارێکی چڕە.
لە (هەنار)ی ژمارە (٣٦)ی ساڵی ٢٠٠٩-ەوە وەرگیراوە.



## شێرکۆ بێکەس: ژمارەکانی ئەم ساڵەی دوایی هەنار کامڵترو گەییوترو جوانتر بوون

هەروەک (دار هەنار) خۆی چۆن لەبنەتووێکەوە ئەپرسکێ و دواتر ئەبێتە نەونەمامێکی ناسک و دواتر گەڵاو گوڵەکاو لە کۆتاییدا (هەنار)ی گەییومان پێ ئەبەخشێ! گۆڤاری (هەنار)یش وەک بەو دەورو سووڕی نش و نماکردنەی (دار هەنار) خۆیدا تێپەڕبێ وایە... ژمارەکانی ئەم ساڵەی دوایی هەنار کامڵترو گەییوترو جوانتر بوون!. بەواتایەکی تر ئەزموون و چڕوپڕی کۆمەڵێ وتارو هەندێ شیعری جوان و ئەفراندن ڕەنگ و ڕوو و سیمای (هەنار)یان باش گەشانەوە!

کاتی ئەوە هاتووە گۆڤاری هەنار کۆمە مەنگەکانی خۆی بە پرسیاری ترسناکترو وروژێنتر بوروژێنێ و بچێتە ناو ئەو خانانەوە کە ئەکەونە ئەو دنیا حەرامانەوە، کە داب و نەریتی چەقبەستووری سەدان ساڵە دروستیانکردوون.

لە (هەنار)ی ژمارە (٣٦)ی ساڵی ٢٠٠٩-ەوە وەرگیراوە.



## شێرزاد هەینی: (هەنار) جوانە لەبەرئەوەی فرە بابەتەو لە هەموو ژمارەیەکی چاوەڕوانی ناوی نوێ و بابەتی نوێ و دەقی دەگمەنی لێدەکرێت

(هەنار) بەوە جوانە، کە مانگانە دەردەچێت، بەڵام ئەگەر وا بکرێت هەموو مانگێک لە یەک ڕۆژدا دەربچێت، بۆ نموونە لەبەرئەوەی وشەی (هەنار)، لە پێنج پیت پێکهاتووە، ئەگەر مانگانە لە ڕۆژی ٥ی مانگ دەربچێت و ئەو ڕێکەوتە بە پیرۆزی و بە باشی ڕابگیرێت.

(هەنار) جوانە و شیرینە، دەستخۆش بۆ هەڵبژەکان، هەڵەی کەمە، ئەوەش لەماندبوون و دڵسۆزانی بەڕێوەبەرانی گۆڤارەکەوەیە.

(هەنار) جوانە لەبەرئەوەی فرە بابەتەو لە هەموو ژمارەیەکی چاوەڕوانی ناوی نوێ و بابەتی نوێ و دەقی دەگمەنی لێدەکرێت، سەر لە دەلاقەی ئەدەب و نووسەرانی هەموو جیهانیش دەدات، بەڵام چەند لەو ڕووەوە بکرێتەوە دەوڵەمەندتر دەبێت، بە دیمانە و بیرەوەری و یاداشتنامەکانیان خوێنەران بە ئەزموونی گەورە نووسەران ئاشنا دەبن.

دەقە شیعرییەکان جوان هەڵدەبژێرن، زۆریان دەخوێندرێنەوە، بابەتەکانی تایبەتن بە رەخنەی دەقەکان، شیاوی خوێندنەوەن، وشک و درێژدادڕن نین.

هەنار جوانە، چونکە بۆنی حزبایەتی و ناوچەگەری پێوە دیار نییە، بەڵام ئەگەر بکرێت زۆرتر دابەشبکرێت و بگاتە هەموو شارەکان، دیارە کەوا حکومەتی هەرێم پارەی دەرچوونی گۆڤارەکە دەدات و چاوی لە بازاڕی خۆی نییە، جوانتر دەبێت ئەگەر بگاتە زۆر لە مەڵبەندەکانی فێربوون و کارکردن و جڤاتەکان.

(هەنار) جوانە، چونکە پاداشتی ماندبوونی نووسەران دەدات، بەجوانی و بەباشی پاداشتەکە دابەش دەکرێت.

لە (هەنار)ی ژمارە (٣٦)ی ساڵی ٢٠٠٩-ەوە وەرگیراوە.



## تەیب جەبار: (هەنار) یەکێکە لە گۆڤارە ئەدەبییە باشەکان

دوای سڵاو و خۆوشەویستی..
پیرۆزباییساڵیادی دەرچوونی گۆڤاری (هەنار) لەسەرنوسەر و دەستەی نوسەران و کارمەندانی دەکەم، هیوای بەردەوامی گۆڤارەکە و لەشساغی و تەمەن درێژی بۆ خۆشیان دەخوازم.
ئەمرۆ لە هەرێمی کوردستاندا گۆڤاری ئەدەبی و نوسەری ئەدەبی زۆر بووە، هەر شتێکیش زۆر بوو، بۆری تێدەکەوێ. گۆڤاری (هەنار) یەکێکە لە گۆڤارە ئەدەبیە باشەکان کە کۆمەڵێ ئەدیب و نوسەر و خوێنەری باشی لە ناوەوە و دەرەوەی هەرێم لە خۆی کۆکردۆتەوە و مانگانە لە کاتی خۆیدا بە چاپێکی جوان و دیزاینێکی رێکوپێک دەردەچێت. لەم یادەدا دوو شت دەڵێیم، یەکەم/ هەوڵ بدات بۆری نەکەوێتە بابەتەکانیەوە. دووەم/ هەرچەندە لە سایتی دەنگەکان بڵاو دەبێتەوە، بەڵام هەوڵ بدات لە ناوەوەی هەرێمدا دابەشکردنی نوسخەی وەرقی فراوانتر بکات.
جارێکی تر هیوای بەردەوامی و بەرەوپێشچوونی زیاتر بۆ گۆڤارەکەتان دەخوازم .
لەگەڵ رێزدا..



## پێشەوا محەمەد: بەبڕوای من هەنار لەناو گۆڤارە ئەدەبییەکاندا، لە ئێستدا، لە هەموویان باشترە

گۆڤاری هەنار دەخوێنمەوەو هەمیشە دەیبینم... بەبڕوای من لەناو گۆڤارە ئەدەبییەکاندا، لە ئێستادا، لە هەموویان باشترە.
ئەوەی هەمیشە هەناری پێ دەناسرێتەوە، ئەوەیە کە بایەخێکی بەرچاو بە قەڵەمی گەنجان دەدات، دیارە بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە پێوستە چاودێرییەکی باش لەسەر دەقی ئەو گەنجانە بکرێت کە بڵاودەکرێنەوە.
تەنها تێبینییەک کە لەسەر هەنار هەم بێت ئەوەیە، کە ئیدی پێویستییەکی ئێستای گۆڤارەکەیە دیزاین و فۆرمی خۆی بگۆڕێت.
بەهیوای سەرکەوتنی هەمیشەییم بۆ ستافی هەنار



## پشتیوان عەلی: ناونانی شارێک وەک پایتەختی ڕۆشنبیری مەرجی یەکەمی دەستکراوەیی و بوونی ئازادی زیاترە

لەگەڵ بوونی شارو دەرکەوتەکانیدا زەرورەتی سەرهەڵدانی ئەم جۆرو تایپانە لەگۆڤار لەکایەی ڕۆشنبیریدا بوونی هەبووە و هەیە نیشان دان و ناونانی شارێک وەک پایتەختی ڕۆشنبیری مەرجی یەکەمی دەستکراوەیی و بوونی ئازادی زیاترە.

بۆیە لەگەڵ ناونانی شاری سلێمانی بەپایتەختی ڕۆشنبیری هەبوونی ئەم جۆرە گۆڤارانە و لەپاڵیشیدا گۆڤارگەلێکی وەکو گەلاوێژی نوێ زەرورەتێکی حەتمییە. لەپاڵ ئەوەشدا گۆڤاری هەنار وەک هەرکایەیەکی تری دونیای ڕۆشنبیری کوردی بەدەرنەبووە لەکەم و کووڕی، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا وەک ئیتیکی کاری خۆی لەگەڵ پیشاندانی هەرجۆرە ناهاوسەنگییەکدا دەنگی گەنج و ئەدیبانی نیشانداوەتەوە.

بۆیە پاراستن و دەستکاری کردنی ئیتیکی و لەپاڵیشیدا زیادکردن و هەڵوەستەکردن بۆمانەوەی

گۆڤارەکە ئەرکێکی ئەخلاقی و مێژووییە...



# شاملوو؛

# پەیڤی تایبەت، دەردی هاوبەش

● رەزا عەلی پوور



**ئەم وتارە، پێشەکی و خوێندنەوەی هەڵبژاردەیەکی شیعری "ئەحمەد شاملووە" بە ناوی (ئاوێنە لە بەرامبەر ئاوێنە) لە وەرگێڕانی (بەڕۆژ ئاکرەیی) کە (غەزەلنووس) چاپ و بڵاوی دەکاتەوە.**

(١)

نووسین لەمەڕ ئەحمەد شاملوو (الف- بامداد)ەوە، کە توێژینەوە و باسی زۆر لە بارەی بەرهەمەکانییەوە کراون، تا رادەیەک سانایە، بە تایبەت، کە مەبەست ناساندنی شیعری شاملوو بێت، بۆ زمان و ئەدەبێکی دیکە، بەڵام ئەگەر مەبەست قسەیەکی تازەتر و گوتەیەکی نەگوتراو بێت، ئەم کارە تا رادەیەک دژوار دەبێتەوە. ئەمەیش هۆکارێکی چەندلایەنەی هەیە. یەکێکیان پێوەندیی بەوەوە هەیە: شاملوو لەو شاعیرانەیە، کە لە چاو زۆربەی شاعیرانی دیکە، پشتگوێ نەخراوە و خوێندراوەتەوە. هەروەها دژوارتر دەبێتەوە، کاتێک بزانین

شاملوو وەک زۆرێک لە نووسەران و شاعیرانی سەدەی بیستەم، لە وڵاتانی ناسوننەتی و نامودێرندا، کاری لە چەند ڕەهەندێدا کردووە. بۆیە سیمای شاملوو جگە لە شاعیر، هەندێکجار وەک وەرگێڕ و نووسەر و ڕەخنەگر و ڕۆژنامەوان و فەرهەنگنووسیش دەردەکەوێ. تێگەیشتن لەو چەشنە نووسەر و شاعیرانە، تا ڕاددەیەک پێوەندیی بە دۆخێکەوە هەیە، کە تێیدا پەروەردە دەبن. زۆرجار تایبەتمەندییەکانی ئەو دۆخە بە کورتی بریتی بووە لە دۆخێکی پارادۆکسیکاڵ و دابەشکراو لە نێوان سوننەت و دنیای نوێدا و هەوڵدان بۆ: نوێکردنەوە، ئارشیڤسازی، پاکسازی، سازدان و جێخستنی وردەکولتوور و... . ئەمەیش وایکردووە بەرهەمی ئەو کەسانە -هەروەکو هێگل دەڵێت، زیاتر لە دیتران منداڵی سەردەمی خۆیانن- تووشی هەمان پارادۆکسانە ببن.

حەز و ویستێکی ژوورنالیستی هەیە، کە دەیەوێت سیمایەکی یەکدەست لە شاملوو ئاراستە بکات، بەڵام خودی ئەو هەوڵە جیاوازانە و لە پاڵ یەک دانانیان دەیسەلمێنێ، کە جگە لەوەی شاملوو لە بواری جیاواز و دوورلەیەک کاری کردووە، تەنانەت لە خودی شیعریشدا، هەندێک ئەزموون و سەرکەوتن و دابەزینی جیای هەبووە و هەندێک ڕێی بڕیوە، کە دوور و دژبەیەک دەردەکەون. لێرەدا بەبێ ئەوەی مەبەست بێت، کە شاملوو بۆ تاقە ڕەهەندێک کورت و پوخت بکرێتەوە، زیاتر باس لە شاملووی شاعیر دەکەین. هەروەها بۆ ئەو پارامێترانە دەگەڕێین، کە ڕەنگە لە شیعری شاملوودا بەرجەستەتر بن.

(٢)

وەک ئەزموونێکی تاکی، ئەو کاتەی تازە دەستم دابووە نووسینی شیعر، ناوی ئەحمەد شاملوو بۆ من و ڕەنگە زۆر کەسی دیکە، لە تەشقی ناوبانگدا بوو. شاملوو نموونەی باڵای شاعیرێکی نوێخواز و هاوکات هەڵوێستدار و دەرگیر بوو. جگە لە بەرهەمەکانی، ناوبەناو باس و گوتەیەکی سەرسووڕهێنەری لێ دەگێڕدرایەوە. وەک نفرینکردنی کاوەی ئاسنگەر و بەسۆسیالیست-کردنی(!) ئەژدەهاک، یان هەمان زوحاک. دواتر، کە بەرەبەرە و بە شێوەی ڕێژەیی، واقعییەتی شاملووم بۆ دەرکەوت، زانیم بەشێکی زۆری سیمای ئەو شاعیرە لە تەشقدا، کە خۆی بە دێوی جوان پێناسە دەکرد، بە هۆی حەجم و گرنگیی بەرهەمەکانیەوەیەتی، کە زیاتر لە ئەفسانە نزیکی دەکاتەوە. بێگومان گەیشتن بەم ئاست و سیمایە و مانەوە لەو پێگەیەدا، هێندە سانا نییە. ئەوەیش کاتێک بۆمان دەرکەوێت، لە فەزای ئەدەبیی ئێراندا، شیعر بەردەوام گرنگیی خۆی هەبووە و ئەم کایە

ئەدەبییە، لە باری ئەدەبی و سیاسی و تەنانەت کۆمەڵایەتییەوە، هەستیار بووە. شاملوو، بۆ ماوەی زیاتر لە چوار دەیە و لە فەزایەکی وەهادا، لە تەشقی شیعردا جووڵەی کرد و ددانی پێدا نرا و وێڕای ئەوەی، کە هەندێک لایەنی نەیار و دژیش ددانیان پێدا نەنا، بەڵام سوود و کاریگەرییان لە بەرهەمەکانی وەرگرت. ئەمە کاتێک گرنگتر دەبێتەوە، کە بزانین لە سەردەمی شاملوودا، ئاڵوگۆڕە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان، وەک کوودەتا و شۆڕش و شەڕ و... توانییان جوانەمەرگی تووشی زۆر شاعیر و نووسەری دیکە بکەن.

بە گشتی، نووسین لە بارەی شیعری شاملووەوە، بۆ من حاڵەتێکی وەک بیرەوەریی هەیە. نەک بیرەوەریی خۆم، بەڵکو وەیادهێنانەوەی ئەو شتانەی وەک بیرەوەری دەبوونە زەینییەت و نموونەی شاعیربوون، یان گێڕانەوەی زەینییەتی رۆژانێکە لە سەر کەسێک، کە لە هێرەمی نرخاندن و بایەخدانەریی مندا، لە لووتکەدا بوو. یەکێک لەو یادانەی لە بیرمدا ماوەتەوە، تەوەری گۆڤارێکی ئەو کاتەیە، بە ناوی گەردوون. گەردوون، پرسیارێکی لەم چەشنەی ئاراستەی کۆمەڵێک نووسەر، هونەرمەند و شاعیر کردبوو:

**-بە بۆچوونی ئێوە، گەورەترین شاعیری ئێرانیی فارسی کێیە؟**

ئەوەی بۆ من سەرنجڕاکێش بوو، ناوی شاملوو لە پاڵ حافز، مەولانا، سەعدی و فیردەوسیدا، دیارترینی ناوەکان بوو. بەم جیاوازییەوە، کە شاملوو هێشتا زیندوو بوو. ئەحمەدڕەزا ئەحمەدی شاعیری بە نێوبانگی ئێرانی، لە گوتوبێژێکدا دەڵێت: "ئەو کاتەی ئێمە گەنج بووین، شاعیرە پیرەکان ناسراو بوون، ئێستە کە پیرین، شاعیرە گەنجەکان ناسراون." ئەگەر ئەم گوتەیە بۆ هەر شاعیرێکی ئێرانی بە راست بکەوێتەوە، بۆ شاملوو پێچەوانەیە. چونکە، شاملوو لەو کاتەوەی هەوای تازەی نووسی، تا دواڕۆژی ژیانی و بگرە ئێستایش بەردەوام ناسراو و لە تەشقی نێوبانگدا بووە. رەنگە لە ئەدەبیاتی ئێراندا کەس بە قەدەر شاملوو، لە ژیانی خۆیدا تامی ناسراویی نەچەشتبێ. ئەمەیشیان بە لەبەرچاوگرتنی ئەو حەزە فراوان و هەوڵە هەندێکجار زێدەڕۆیانەی، کە بۆ مانەوە و نێوبانگ دەیدان. خودی ئەم حەزە هەندێکجار شاملووی بەرەو باسکردن و دوان لە هەندێک بابەت بردووە، کە رەنگە ئیشی پسپۆڕانەی ئەویش نەبووبێت، بەڵام لە هەر حاڵدا هەموو بۆچوون و نووسینێکی شاملوو، تەنانەت لە بارەی مۆسیقا و ئوستوورە و... لە فەزای رۆشنبیریی ئێراندا گرنگیی خۆی بووە. ئەمەیش دیارە بە هۆی هەمان نێوبانگەوە بووە. بە گشتی، شاملوو، لە ژیانی خۆیدا ناسراوترین شاعیری ئەدەبی هاوچەرخی ئێرانی بووە.

(٣)

جیاوازییەکی گەورە لە نێوان ئەدەبی فارسی و کوردی و ڕەوتی مێژوویی ئەم دوو ئەدەبە، بە تایبەت لە بواری شیعردا هەیە. بە ڕوانینێکی گۆڵدمەنییەوە، ئەم جیاوازییە تا ڕاددەیەکی زۆر قەدەری شیعریی شاعیرەکانی هەر لایەکیان دیار دەکات. لە شیعری فارسیدا، ڕەنگە وەک شیعری زمانانی دیکەیش، بزاوتێکی مێژوویی و هەندێکجار دیالێکتیکی هەیە. ئەمە بە نیسبەت شیعری کوردییەوە، کەم تا زۆر غایبە. بۆ نموونە: لە شیعری کلاسیکی فارسیدا، ئاوڕدانەوەیەکی بەردەوامی شاعیران بۆ دەقی پێش خۆیان دەبیندرێت. ناکرێت بە تەواوەتی درک بە حافز و مەولانا و... بەدەر لە پێوەندییان لەگەڵ شاعیران و عارفانی پێش خۆیاندا بکەین. ئەم حاڵەتە وا دەکات، کاتێک نیما یوشیج دەست دەداتە نوێکردنەوەی شیعری فارسی، بەشێکی زۆری نوێخوازییەکەی لە بەرانبەر شیعری پێشینانی خۆیدا پێناسە بکات. واتە نوێکردنەوەکەی دەستکاریکردن و گۆڕان بووە لە هەناوی شیعری پێشووی فارسیدا. بۆیە ناچار بووە ڕادەی دابڕان و بەردەوامی و پێوەندی و تەکلیفی شیعریی خۆی لەگەڵ ئەو دەقانەدا دیار بکات. بە نیسبەت شیعری کوردییەوە، پێویست بە زیرەکییەکی وەها ناکات، کە بزانین وا نەبووە. بۆ نموونە: نالی، هیچ ئاوڕێکی چاک، یان خراپی، لە ئەزموونی شیعری مەلای جزیری و خانی و... نەداوەتەوە. ئەگەر سەیری نەخشەی شیعری فارسی بکەین، تێدەگەین ڕەوت و شێوازەکان پێوەندیی ناوەکییان پێکەوە هەیە، بەڵام بە نیسبەت شیعری کوردییەوە، هەست دەکرێت وەک کۆمەڵە دوورگەیەکی دوورلەیەک بیناکراون. دەڵێی بۆ ئەدەبی گۆرانی (هەورامی) ئەزموونێکی وەک جزیری و فەقێ تەیران هەر نەبووە، یان ئەدەبی سەردەمی بابانەکان، ئاوڕێکی ئەوتۆی لە ئەدەبی گۆرانی نەداوەتەوە و سوودی لێ وەرنەگرتووە. ئەم حاڵەتە هەر پاساوێکی بۆ بێتەوە، دواجار واتای لێکنەدران و نادیالێکتیکی-بوونی ڕەوتی شیعریی لێ دەکەوێتەوە. ئەم نەبوونی جووڵەی دیالێکتیکییە، لە سەدەی بیستەمدا، لە جوگرافیا و دیالێکتەوە بەرەو نیوکلاسیسیزم و نوێخوازییش دەکشێت و بۆ سەردەمی نوێبوونەوەی شیعریش درێژەی هەیە. ئەگەر نیما لە کاتی نوێکردنەوەی شیعردا، لەگەڵ ململانێ و ڕەتکردنەوەیەکی توندا بەرەوڕوو دەبووەوە و نەدەکرا بە سانایی لەگەڵ دواکلاسیکییەکاندا بە ڕێکەوتنێکی هەرچەند ساختەیش بگات، یان لە تورکیادا ئەگەر نوێخوازانی وەک مەلیح جەودەت و ئوکتای ڕەفعەت و نوێخوازانی دیکە، لەگەڵ لایەنگرانی شیعری

کلاسیک و ئەدەبی سوننەتی و عوسمانلیدا لە ململانێدا بوون، لە زمانی کوردیدا عەبدوڵڵا گۆران بە بێ ململانێ و کێشەیەکی ئەوتۆ، دەیەوێت شەرعییەتی نوێخوازییەکەی خۆی لە کلاسیکێکی دواییەوە، واتە لە پیرەمێردەوە وەربگرێت. تەنانەت هەر خودی پیرەمێردیش هەندێک لە شیعرەکانی بۆ چاپ دەکات و... لێرەدا کۆمەڵێک پرسیار سەرهەڵدەدەن، کە وەڵامدانەوەیان تارادەیەکی زۆر، دەتوانێت بەشێکی گرفتەکانی ئەدەبی کوردی لە ئێستایشدا روون بکاتەوە. بۆ نموونە: بۆچی نوێکردنەوەی شیعر لە کوردستاندا نەبووە مایەی ململانێیەکی لەو چەشنەی لە ئەدەبی وڵاتانی دیکەدا سەری هەڵدا؟ لە هەر حاڵدا، بوونی ئەو دۆخە دیالێکتیکییە لە ئەدەبی فارسیدا، وا دەکات، ململانێیەکی توند لە نێوان ئەدەبی نوێ و کلاسیکدا ساز ببێت و نوێخوازی و نانوێخوازی سنووریان بۆ دیار بکرێت. هەروەها شاعیرەکان لە نێو کۆنتێکستێکی مێژوویی و دەقیدا باشتر دەربکەون و سەرلەبەری شیعری فارسی وەک یەکەیەکی پێوەندیدار سەیر بکرێت، کە زیندوویی خۆی لە پێوەندیی رەخنەگرانە و رەتکردنەوە و تەئیدی دیالێکتیکییەوە وەردەگرێت. بێگومان، خوێندنەوەی شیعری شاملوویش لەم حاڵەتە بەدەر نییە.

(٤)

کاتێک نیما یوشیج، لەساڵی ١٩٣٩دا، بە چاپی شیعری "ئەفسانە"وە، خۆی گوتەنی: ئاوی کردە خەوگەی مێروولەکانەوە؛ کۆتایی بە تەمەنێکی دووردرێژی شیعری کلاسیکی فارسی هێنا. لەسەر بنەمای درێژەدان و دابڕانی دیالێکتیکی لە شیعری فارسیی پێش خۆی و کاریگەریی وەرگرتن لە سەمبولیستەکانی فەڕەنسا، سەرەتایەکی نوێی دامەزراند. نیما لەو کاتەدا لە لایەن ئەدیبە جێکەوتوو و ناسراوەکانەوە بە توندی رەتکرایەوە، بەڵام هەندێک لە گەنجەکان پێشوازییان لێی کرد. یەکێک لەو گەنجانە ئەحمەد شاملوو بوو. شاملوو، کە تا کۆتایی تەمەنیشی بەردەوام خۆی بە شاگرد و قەرزداری نیما دەزانی، هاوکات هەم گەورەترین درێژەپێدەری نیما و کۆمەڵێک لە بۆچوونەکانی نیما بوو، هەم رەتکەرەوەیشی بوو. بەشێکی تێگەیشتن لە شاملوو، لە گوزەری تێگەیشتن لە شیعری نیما و لەوەیش گرنگتر، لە بیروبۆچوونەکانی نیماوە سەبارەت بە شیعر، سەر دەگرێت. واتە شاملوو لە دەستپێکەوە، تا دوایین شیعرەکانی هەوای تازە، کۆمەڵێک شیعری لە چوارچێوەی شیعری نیماییدا نووسی و لەگەڵ کەسانی وەک نوسرەت رەحمانی و ئەخەوان سالسدا، توانییان پارمەتیدەری جێکەوتنی شیعری نیما و نیمایی ببن. بەڵام لە هەوای تازەدا، شاملوو، مەودایەکی لەگەڵ

نیمادا سازکرد و له شیعری نیمایی و له شاگردەکانی نیما دوورکەوتەوە. ئەم دوورکەوتنەوە و دەستپێکە تازەیە، سیمای شاعیرێکی نوێخواز و داهێنەری لە شاملوو خستە بەرچاو، کە دەستەیەک وەک شۆڕشێک لە نێو شۆڕشەکەی نیما و کاملکاری ئەو باسی دەکەن و هەندێکی دیکەیش بە درێژەی لۆژیکیی بزاوتی نیمای دەزانن و خۆیشی هاوکات بە هەردووکیانی دەزانێت. ئەو کاتەی شاملوو هەوڵی نووسینی تایبەتیی خۆی دەدا و هەندێک لە بیروبۆچوونەکانی نیمای وەک نزیککردنەوەی شیعر لە دیکلیماسیۆنی سرووشتیی گوتە و... جێبەجێ دەکرد، هاوکات بەرەی شەڕێکی لەگەڵ ئەدیبە سوننەتییەکاندا کردەوە، کە لەگەڵ چەند کەسی دیکەدا توانیی بۆ هەمیشە شیعری نوێ و نوێخوازی لە ئەدەبی فارسیدا جێ بخات.

(٥)

ڕەنگە گەڕانەوە بۆ شیعری شاملوو و هەوڵەکانی شاملوو، بە سانایی ئەمە بسەلمێنێت، کە زۆرترین هەوڵی بۆ جێخستن و جێگیرکردنی شیعری نوێی فارسی داوە. هەروەها بە شێوەی تایبەتیی خۆی دەستی دایە تیۆریزەکردنی شیعری نوێ. هەوڵێک، کە لە خودی نیماوە دەستپێکرد. ئەمە نەک بەو واتایە، کە شاملوو پشتی لە ئەدەب و شیعری کلاسیک کردبێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە، بەردەوام ئاوڕی لە پەخشان و شیعری کلاسیک داوەتەوە و سوودێکی زۆریشی لە زمانی ئەدەبی کلاسیک وەرگرتووە. شاملوو، لە کتێبی هەوای تازە بەملاوە، کێش و سەروا و عەرووزی نیمایی وەلا نا و لەباتیی کێش و سەروا، بیری لە ئالتێرناتیڤی دیکە کردەوە و لە سەرووی هەموویانەوە، مۆسیقای ناوەکیی هەڵبژارد. بۆ ئەمەیش، ڕێیەکی دژواری گرتەبەر، کە بریتی بوو لە بانگهێشتکردن و ڕۆچوون بەنێو ئەدەبی پەخشان و شیعری فارسیدا و دۆزینەوەی زمانێکی تایبەت و موتوربەکردنی ئەم زمانە بە بابەت و باسی ڕۆژ و زمانی سەردەمەوە. ئەو هەڵبژاردنەی شاملوو، تەنیا دۆزینەوەی لایەن، یان بەردەبازێکی فۆرمێک نەبوو، بەڵکو بەو هەڵبژاردنەوە، شاملوو هەوڵی سازکردنی نیگایەکیشی دا، کە بە نیسبەت شیعری فارسییەوە، نیگایەکی تازەتر بوو. تایبەتمەندیی ئەم نیگایە، بریتی بوو لە ئامادەبوونی مرۆڤ، یان سوبژەیەکی هاوکات عاشق و خەباتکار و هەڵوەدای جوانی و پاکی و دژ بە ناشیرینی و تاریکی. ئەم سوبژەیە، هەندێکجار بە تۆخی و هەندێکجار بە کەمڕەنگی لە سەرانسەری شیعری شاملوودا دەبینرێت. هەروەها من و پێرسۆنایەکی دیکەی شاملوو، تا ڕاددەیەک نارسیستی

و خۆخۆشەویستە، کە ئەم پێرسۆنایە زۆرجار بۆ خودی کەس و تاکی شاعیر دەگەڕێتەوە و حەز بە ستایش، دیتن، لە لووتکەدابوون و قارەمانیەتیی دەکات. شاملوو، لە تێکەڵکردنی ئەم دوو سوبژەیە، کە لە هەندێک خاڵدا بە سانایی پێکەوە کۆناکرێنەوە، وەک: (فیداکار/ خۆخۆشەویست) پێرسۆنایەکی تایبەت ساز دەکات، کە دیسان لە شیعری فارسیدا، تازەیە. ئەم سوبژەیە، کاتێک لە من دەدوێت، مەبەستی ئێمەیە و کاتێک تاکیش لە ئارادایە، نوێنەرایەتیی هەمان ئێمە دەکات. بۆیە مرۆڤی شاملوویی سەرلەبەر تیپیکاڵن. بە گشتی، نیگای شاملوو بۆ مرۆڤ قارەمانخواز و تاڕاددەیەک ئایدیالە. مرۆڤی شاملوویی دەردی هەیە، دەردی هاوبەش، زۆرجار جەنگاوەرێکی عاشقە، بۆیە ناڕازییە و هەندێک جاریش رۆمانتیکە. پێرسۆنای ئاخێوەریشی هاوکات هەم پێیەکی لە نێو بایەخە ئەزەلییەکاندایە و هەم دژی رەشی و تاریکی و ناشیرینییە، کە بە لایەنگریی نوێبوونەوە و تازەیی شەڕ دەکات. ئەمانەیش بە بۆچوونی شاعیر، لە کۆنەکان و رابردووەوە سەرچاوە دەگرن. ئەم سوبژەیە، کە پێرسۆنا و زۆرجار ئاخێوەری زۆربەی دەقەکانی شاملووە و لە دەردە هاوبەشەکان دەدوێت، شیعری ئەوی کردووە بە شیعرێکی دەرگیر و گشتبین، کە بڕوای بە بنبڕیەتی، یەقین، خێری گشتی، بەدی، شەڕ، جوانیی رەها و... هەیە. گشت ئەمانەیش لە راستای تەئیدی ژیان و هەندێکجار مەرگی بە شکۆ و فیداکارانە (لە رێی جوانیدا) و بەرەوپێش رۆیشتن و تازەبوونەوە دەخاتە گەڕ. ئاساییە لێرەدا، جوانی بۆ شاملوو، بە پێناسە کانتییەکەی واتایەکی ئەوتۆی نییە و جوانی و دەقی شیعری ناتوانێت بۆ خۆی و ناسوودمەند بێت. بۆیە، شیعری شاملوو زۆرجار (لە عاشقانەترین شیعرەکانیشیدا) ناتوانێت خۆی لە ئازار و کێشە کۆییەکان، ناهومێدییە گشتییەکان، ستایشی بایەخە ئومێدبەخشەکان و پرسەکانی کۆمەڵ لا بدات، بەڵام، شاملوو هێندە زیرەک و وریایە، کە سیاسەت و هەڵوێست نەکات بە جەوهەری شیعری و سەرجەم رەهەندەکانی شیعر لە خەیاڵ و زمانەوە بۆ وێنە و مۆسیقا و فۆرم نەخاتە خزمەتی واتاوە. هەروەها ئەوەندەیش بە توانایە، کە هەموو واتایەکی مەیلەوئایدیۆلۆژیک بە بابەتێکی گەورەترەوە گرێ بداتەوە، وەک لایەنگری لە جوانی، عەشق، ئینسانییەت و بایەخە باڵا مرۆییەکانی دیکە.

(٦)

شیعری شاملوو، چەند ناوێکی وەک شیعری بێ کێش، سپید (سپی) و... لێنراوە، بەڵام وێدەچێ، شاملوو توانیبێتی وەک نیما، زیاتر لە هەموو ناوێک

بۆ شیعری خۆی، ناوی شیعری شاملوویی جێخستبێت. شاملوویی بوون وەک تایبەتمەندییەک، هەم دەقی بەهێزی لێکەوتەوە، هەم دەقی لاواز. خوێندنەوەی رەوتی شیعری شاملوو، ئەم راستییە دەردەخات، کە شاملوو لە دابەزین و هەستاندا، زیاتر بەرەو هەستان رۆیشتووە، بەڵام دابەزینەکانیش ئەگەرچی کاتین؛ دیسان بەرچاون. شاملوو، بەردەوام هەوڵی بیناکردنی کۆشک و تەلارێکی دا، کە: شکۆ، ئەڤینداریەتی، پێداگری، لایەنگری لە بایەخەکان، (بە فۆرم و شێوازی جیاوازەوە) گرنگترین تایبەتمەندییەکانی ئەو کۆشکەن.

ئەگەر نەڵێین زمان گرنگترین چەمکی فەلسەفی و ئەدەبیی لە سەدەی بیستەمدا بووە، بێگومان لە گرنگترینیان بووە. تا ئێستایش کەڵکەڵەی زۆربەی شاعیران و بیرمەندان لەگەڵ ئەم بوونەوەرەدا و تێگەیشتن لە کارکرد و شێوەی دانوستان لەگەڵیدا کاڵنەبووەتەوە. ئەگەرچی زمان وەک چەمکی فەلسەفی و تەنانەت سیاسییش گرنگیی وەرگرتووە، بەڵام ئەدەبیات و بە تایبەت شیعر، لەم نێوەدا پشکێکی زۆرتریان بەرکەوتووە. پرسی زمان بە نیسبەت شاعیرانەوە، وەک پرسێکی جەوهەری و سەرتر لەوەیش، چەشنی رەفتار لەگەڵ زماندا، هەندێکجار، وەک خودی پرۆسەی ئافراندنی شیعری لێهاتووە. شاملوویش، وەک شاعیرێکی هەستیار بە نیسبەت وشە و زمانەوە، وەڵام و هەڵوێست و رەفتارناسیی خۆی لە ئاست زماندا هەبووە. لەم روانگەیەوە، ئەوەی لە شیعری شاملوودا زۆر بەرجەستەیە، تەنرانی شیعر و زمانی شیعرییەتی، لە نێو مێژووی زمانی فارسیدا، یان بە واتایەکی دیکە: حەرەکەتکردنیەتی لە سەرانسەری مێژووی ئەدەبی ئەو زمانەدا و شکۆمەندیی زمانی شاملوویش هەر لێرەوە سەرچاوە دەگرێت. ئەم تەنرانە، لە لایەکەوە بریتییە لە دەستهاویشتن بۆ زمانێکی ئارکائیک و موتوربەکردنی بە هەندێک پارامیتری زمانی و کەڵکەڵەی سەردەمەوە، هەروەها رۆچوون بەنێو زمانی کووچە و بازاڕ و تەنانەت ئەدەبی فولکلۆریک و منداڵاندا. خودی ئەم بزاوتە بە گوتەی فورمالیستە رووسییەکان، بەردەبازێکی شیعری و فۆرمێکە، کە دەبێتە هۆی بەرجەستەبوونی شیعرییەت. ئەگەر بەربژاری هەندێک شاعیر لەگەڵ زماندا بەوە دەگات، کە زمان و بەرجەستەکردنی زمانی ببێتە هەموو، یان زۆر لایەنی شیعر، ئەم تایبەتمەندییە بە لای شاملووەوە، نەک بۆ چۆن گوتن، بەڵکو بۆ خودی گوتن، گرنگە. شاملوو، وەک زۆر شاعیری دیکە، بڕوای بە سیحری پەیڤ هەیە و تەنانەت زمانی بە لاوە پیرۆزە. بەڵام نەک پەیڤ لە خودی خۆیدا، بەڵکو هاوکات، هەم بۆ خۆی و هەم بۆ مەدلوول و واتاکان. واتای پەیڤەکانیش لە خزمەتی بایەخە جاویدەکاندایە، کە

مرۆڤ و مرۆڤایەتی بە شێوەی گشتی و تیپیکاڵ لە ژوور هەموویانەوەیە. بۆ شاملوو، زمان- یان وەک خۆی دەڵێت پەیڤ- بە واتا و دەنگیەوە گرنگە. ئەم گرنگییە تەنیا بە دیوێکی فۆرمیکدا گرنگیی پێ نادرێت، بەڵکو هەروەکو خودی شاملوو بەردەوام جەختی لەسەر کردووە، گوتن بۆ ئەو لە پێشترە. واتە، گوتن بۆ شاملوو بریتییە لە: هەڵبژاردنی وشە بۆ گوتن و رەچاوکردنی باری واتایی و باری مۆسیقایی پەیڤ و پیتەکان (ئێلیترەیشێن). بۆیە، شیعری شاملوو، بەردەوام دەیەوێت قسەیەکی هەبێت، دەیەوێت شتێکی شایانی گوتنی هەبێت، کە مۆسیقا و تۆن و دەنگی پەیڤەکانیش (نەک یارمەتیدەر)، بەڵکو بەشێکی سەرەکی بن. بەو بەربژارە زمانییەوە و بەم داواکارییەوە، بە ناچاری رەهەندێکی پارادۆکسیکاڵ سەرهەڵدەدات. واتا رووکردی شاملوو بۆ بەردەبازێکی فۆرمیک، ئەنجامگیرییەکی واتایی و ناوەڕۆکیی لێ دەکەوێتەوە، کە چییەتیی ئەم پارادۆکسە دەخاتە بەرچاو. بەڵام ئەمە لە دەقە شیعرییەکانی شاملوودا بووەتە تایبەتمەندییەکی سەرەکی و لە سادەترین دەرکەوتەیدا، وەک نموونەیەک دەتوانین بڵێین، شاملوو، بە زمانێکی پڕشکۆ و ئارکائیک و تەنانەت هەندێکجار شەتحیاتی عیرفانییەوە، باسی رۆژانەترین کەڵکەڵەکان و مرۆڤەکانی سەردەم و عەشقە زەمینییەکان دەکات. لێرەوە، شیعری شاملوو بەردەوام غافڵگرمان دەکات، هەم لە باری زمانی و هەم لە باری واتاییەوە، شاملوو زۆرجار بە پێداگرییەوە ئەندێشە و بۆچوونی خۆی لە شیعردا دەردەبڕێ، بەڵام بە زمانێک کە ئاهەنگ و ئیقاع، یان هەمان مۆسیقای ناوەکی، لە حاڵەتی مانیفێست و یەقین دووری دەخاتەوە. ئەمەیش هەڵبەت بە یارمەتیی توانای فۆرمیکی دەق و خەیاڵکردی شاعیر سەر دەگرێت، کە زۆرجار شیعر هاوکات هەم لە بواری زمان و هەم لە بواری واتادا روو دەدا.

(٧)

سەرەڕای نزیکبوونی زمانی فارسی و کوردی، رەنگە هیچ شاعیرێکی ئێرانی، جگە لە خەییام- وەک ریزپەڕێک- بەختی ئەوەی نەبووبێت، کە بە باشی بە زمان و ئەدەبی کوردی بناسێندرێت. ئەم داخران و خۆماندوونەکردنەی زمانی کوردی لە ئاست ئەدەبی بیانی و تەنانەت دراوسێ نزیکەکانییەوە، کۆمەڵە هۆکارێکی هەیە، لە سەرووی هەموویانەوە، ترس لە پێوەندی و تەنانەت زەندەقچوون لە گۆڕان و خۆخستنە بەردەم ئەزموونی داهێنەرانەی کولتووری دیکە، چونکە هەموو وەرگێڕانێک بەرمەحەک خستنی کولتوور و زمانی مەبەستە. بە تایبەت وەرگێڕانی شیعر، کە تەنیا راگواستنەوەی واتایی نییە و دەتوانێت کاریگەریەتیی

لەسەر ریشەی زمان و تەنانەت هەندێکجار دەستکاریکردنی بناغەی زمانی مەبەستیشی بەدوادا بێت. ئەمە بەدەر لەوەی، کە وەرگێڕانی شیعر و ئەدەبی داهێنەرانەی وەک: رۆمان و چیرۆک و دەقی فەلسەفی، ناچارە بکەوێتە بەردەم وەرگرتن یان گۆڕین و ئالتێرناتیڤ دۆزینەوە و داتاشینی وشە و چەمک و ریتم و مۆسیقای کولتووری زمانێکی دیکەوە. خودی ئەمە بە نیسبەت زمانی مەبەستەوە، هەم بەختە و هەم ریسک، بەڵام زمانی کوردی- بە تایبەت لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم بەملاوە- لەبەر خۆپاراستن و خواستی رەسەنایەتی، پشتی لەو بەختە کردووە، کە لە رێی وەرگێڕانەوە، گەشەسەندن و کرانەوە بە خۆیەوە ببینێ. لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم بەملاوە، هەوڵێکی سەیر دەبینین، بۆ خاوێنکردنەوەی زمانی کوردی، لە هەموو وشەیەکی بیانی و دواجار هەموو ئەو ریتم و تۆنە جیاوازانەی، کە لەگەڵ زمانی کشتوکاڵیی کوردیدا یەک ناگرنەوە. خودی ئەم هەوڵە- کە وەرگێڕانیشی بەردەکەوێت- یەکێک لە سەرچاوەکانی گرفتی لاوازی ئێستای زمانی کوردییە، کە نیشانە و سیمپتۆمی ترسە لە تێکەڵبوون و لەدەستدانی پاکی و رەسەنایەتی. وەرگێڕان لە پێناسەیەکدا، بریتییە لە لێکدرانی بەرهەمی دوو زمان و دوو کولتووری جیاواز. رەنگە لەم گوزەرەشەوە هەندێک وشەی بیانی دزە بکەنە نێو زمانەوە، بەڵام ئۆپێراتۆری رەسەنخوازیی وەرگێڕانی کوردی، رێیەکی دۆزیوەتەوە، کە بریتییە لە بچووککردنەوەی رەهەندەکانی وەرگێڕان و بە شانازیشەوە دایدەبەزێنێتە سەر وشە پەتییە کوردییەکان. لێرەوە، وەرگێڕان و وەرنەگێران شتێکی ئەوتۆ بۆ زمانی کوردی زیاد ناکەن. لە هەر حاڵدا، وەرگێڕانی ئەو دەقانەی، کە بەستراوی و تێکتەنراویی زمانی و مۆسیقاییان زۆرترە، دژوارترن و ریسکی زیاتریان دەوێت. وەک باسی لێوە کرا، شیعری شاملوویش، هەڵگری هەمان تایبەتمەندییە و بە تەواوەتی پێی لە نێو مێژووی زمانی فارسیدایە. ئەمەیش وەرگێڕانی شیعری شاملوو دژوارتر دەکاتەوە. ئەویش کاتێک بزانین، کە شاملوو، بە کەڵکوەرگرتن لە زمانی ئارکائیکی فارسی، شکۆ و فەخامەتێکی تایبەتی بە زمانی شیعری خۆی داوە. گەر واقیعبینانە لەم زمانە بڕوانین، ئالتێرناتیڤێکی ئەوتۆی لە زمانی کوردیدا نییە و وەرگێڕی شاملوو ناچارە شتێکی دیکە جێنشین بکات. خودی ئەم هەڵبژاردنەی وەرگێڕ، تا رادەیەک قەدەری وەرگێڕانەکە دیار دەکات، یان هەمان ئۆپێراتۆر دەکەوێتە گەڕ و زمانی شاملوویش وەک شکسپیر و بێکێت و فرووغ و کانت و نیچە و دەیاتی دیکە... دەکات بە زمانێکی مەیلەو جووتیاری، یان ریسک دەکات و هەوڵ دەدات زمان، لەحن، ریتم و وشەگەلێکی نوێ و نارەسەن-

بەڵام پێویست- بهێنێتە ناو زمانی کوردییەوە و ئەم زمانە تووشی قەیران و ماندووبوون بکات.

(٨)

بە نیسبەت ئەو دەقانەی، لە شاملوو، وەرگێڕدراونەتە سەر زمانی کوردی، هەندێکیان لە ئاستی باسکردندا نین و رەنگە بایەخی ئەوەیشیان نەبێت، کە بخرێنە بەر روانینی وردی رەخنەییەوە. بەشێکی دیکەش کە قەبووڵکردنێکی رێژەییان لەگەڵدایە، زیاتر رەهەندی واتایی شاملوویان بەرجەستە کردووەتەوە. بە نیسبەت ئەو واتایەوە، ریتمێکی رۆمانتیکیان هەڵبژاردووە، کە زۆرجار لەگەڵ مۆسیقای ناوەکیی شیعری شاملوودا یەک ناگرنەوە. لێرەوە، زۆرجار ئەو ریتم و حاڵەتە (مگنگن و فاخر)ـەی، کە لە دەقی سەرەکیدا هەن، لە دەقی وەرگێڕدراودا نابیندرێن. ئەمانە وایان کردووە خوێنەری کوردیی شیعری شاملوو، بڕوا نەکات، کە ئەم دەقانە بەرهەمی شاعیرێکی ناسراو و گرنگ بن، چونکە زیاتر وەرگێڕانی واتامەدارن و لە باشترین حاڵەتدا کێشیان لە جیاتیی مۆسیقا داناوە. کەواتە وەرگێڕانێکی دیکەی شیعری شاملوو، دەبێت شتێکی جیاوازی هەبێت، کە شیاوی بڵاوکردنەوە بێت. ئەوەی بەڕۆژ ئاکرەیی بە گشتی لەم کتێبەدا چیی کردووە، باشترە بۆ رەخنەگرانی (هەرگیز نەبووی) ئەدەبی کوردی!! دابندرێت. لێرەدا، بە کورتی تەنیا ئاماژە بە چەند خاڵێکی جیاوازی ئەم وەرگێڕانە دەدەم؛ جیاوازییەک لە مەرجی سەرەتایی و پێویستی وەرگێڕاندا هەیە، کە بریتییە لە زانین و زاڵبوون بەسەر هەردوو زمانی دەستپێک و مەبەستدا، کە خاڵێکی گرنگی جیاوازیی بەڕۆژە لە چاو زۆربەی وەرگێڕە کوردەکانی شاملوودا. هەروەها، باش ناسینی جیهانبینی، زمان و شیعری شاملوویی، گرنگی و پێویستییەکە، کە وەرگێڕ وەک شاعیرێک، لە نزیکەوە و لە رێی دەقەکانی شاملووەوە، ئەم مەرجەیشی دەستەبەر کردووە. گرنگتر لەمە، پێموایە: وەرگێڕ، تۆناژ و ریتم و هەروەها ئالتێرناتیڤی زمانیی بۆ زۆربەی دەقەکان سازاندووە و مۆسیقا و زمانی تایبەتی دۆزیونەتەوە، ئەمەیش بە خۆنەبەستنەوە بە ستایلێکی ئامادەی وەرگێڕانی کوردی و کەڵکوەرگرتنێکی بوێرانە لە پوتانسییەلە ناسراو و نەناسراوەکانی زمانی کوردی، بە پێی پێویست و بەرهەمهێنانەوەی شیعرەکان لە زمانی کوردیدا.

لە کۆتاییشدا، بە پێویستی دەزانم ئاماژەیەکی خێرا بە چەند تایبەتمەندییەکی ئەم کۆمەڵەشیعرە بکرێت؛ یەکەم: لەم کتێبەدا هەوڵدراوە رەوتی شیعری شاملوو

و گۆڕانکاری و جۆراوجۆریی شیعرەکانی بنوێندرێت، واتا، تەنیا شیعری عاشقانە، کۆمەڵایەتی، یان ریتمێک هەڵنەبژێردراوە. بۆیە، خوێنەری کورد دەتوانێت تا رادەیەک رەوت و گرایشە جیاوازەکانی شاملوو، بدۆزێتەوە. دووەم: وەرگێڕ، هەوڵیداوە ریسک لە لەحن و مۆسیقا بکات و بە هەستیارییەوە جێگرەوە بۆ دەقی سەرەکی بدۆزێتەوە، کە ئەمەیان لە شیعرە ریتمیک و "موزیکاڵ"ەکاندا بەرچاوترە. سێیەم: وەرگێڕ، تەنیا هەوڵی نەداوە، کە واتا و ناوەڕۆک، بەڵکو ویستوویە فۆڕمی شیعری شاملوویش وەربگێڕێت. ئەمانە بەشێک لەو هەوڵانەن، کە لەم کتێبەدا دراون و مەرج نییە وەرگێڕ لە وەرگێڕانی هەموو دەقەکاندا وەکو یەک سەرکەوتوو بووبێت، بەڵام تێکڕای دەقەکان، ماندووبوونی وەرگێڕ و ماندووکردنی زمانی کوردییان پێوە دیارە.

# رۆمان... ڕێگەیەک بۆ قورمیشکردنی خوێنەر

**(بابەکە نابینم، بەڵام وا هەست دەکەم کە خزایە پەنا دارەکە و رایموسی)**[1]
ئیبراهیم یونسی

**پێشکەشە بە مامۆستا عومەر مارف بەرزنجی**

**دەوەن**

نووسەری بە ئەزموونی خاوەن ئیدراکی تەندروست، ئەو داهێنەرەیە کە دەخوازێت خوێنەرەکانی بەرەو کرانەوەی عەقڵ ببات، نەک لەناو کۆمەڵێک تێکستدا قفڵیان بدات و کەی خواستی بوو، لە ڕێگەی کلیلی قەڵەمەکەیەوە چاو و هەستیان بکاتەوە. ژبەر هەندێک ئەز حسکرد رووی ئەو نووسەر و رۆماننووسانە ئاشکرا کەم کە دەخوازن خوێنەر بۆ خۆیان قورمیش بکەن و وەک دەستگەمە وازی بە شعور و بە هەستیان بکەن. هەروەها خوێنەری زیتاڵ ئەو خوێنەرەیە کە بەبێ جیاوازی گشت تێکستەکان بخوێنێتەوەو پرسیار و گومانی لەلا دروست ببێت، ماوەیەکە دیاردەیەک لەناو نووسەراندا خەریکە دەبێت بەباو، باوی تەنیا خوێندنەوەی یەک نووسەر و یەک کتێب و یەک دەقی شیعر. خولقاندنی کارێکی لەم جۆرە، جگە لەماڵوێرانی بۆ خوێنەری کورد و لاوازکردنی زمانی کوردیی، هیچ خزمەتێکی مرۆڤدۆستانەی تێدا بەدی ناکرێت. بەڵکو ئەزموونی بەشێک لەوڵاتانی دنیا، ئەم حەقیقەتەی پێ ئاشناکردین، کە نووسەرانی سەربە دەسەتەڵات، بەردەوام خاوەنی پێگەی بەرز بوون لەلای دەستەڵات، بەڵام نووسەرانی خاوەن پێگەی ئازادی، ئەو نووسەرانەی کە خەمی کۆمەڵگەیان بە رۆمان دەنووسییەوە و خاوەنی دیدو بۆچوونی خۆیان بوون، بەردەوامیش دوور دەخرانەوە و کتێبەکانیان دەسووتاندن و نووسەرەکانیشیان ئاوارەیی

غوربەت دەبوون، نموونەی گەلەک زۆرمان هەن کە مێژوو شاهیدیانە. ترسێکی ئێجگار خەتەرناکە کە خوێنەری ئێمە، بەرەوڕووی کارەساتی قورمیشکردنی نووسەرێک ببێتەوە، قورمیشکردنی خوێنەر دەستەواژەیەکە دامتاشیوە بۆ ئەو نووسەر و خوێنەرانەی کە بڕوایان بە تاکە نووسەر و تاکە تێکست هەیە. واتە خوێندنەوەی تاکە نووسەر و تاکە رۆمان، بیرکردنەوەیەکی کاڵفامانەیە، جگە لەدوورخستنەوەی خوێنەری بەکەڵک و پەکخستنی رەخنەی تەندروست، هیچ مانایەکی تری نییە. پێشتر بەشێک لەولاتانی رۆژئاوا، گیریانخواردبوو بەدەست شکاندن و قورمیشکردنی خوێنەران و رەخنەگرانی، کە هەندێک رۆشنبیر و رووناکبیر لەژێر سایەیی دەسەتەڵاتدا دروستیان کردبوو. خۆزێ ساراماگۆ ووتەنی (مرۆڤ نابێت هەرگیز رازی بێت ئازادییەکەی لێ وەربگرنەوە)[٢] پەلکێشکردنی دەق و خوێنەر بۆناو بازنەی قورمیشکردن، بە بڕوای من هیچ جیاوازییەکی نییە لەتەک ئەو دیکتاتۆرەی کە کۆمەڵگە بەرەو یەک بونیادی بیرکردنەوە دەبات.

خوێندنەوەی ئێمە بۆ رۆمان، پەیوەندییەکە هێشتا گەرموگوڕ نییە، بەپێچەوانەوە سارد و سڕییەکی خوڵقاندووە، کە ئێمە نەتوانین لە(بەرامبەر رۆماندا، هیچ کاردانەوەیەکی رخنەگرانەمان هەبێت. قسەکردن و راڤەی من لەسەر رۆمان، بیرخستنەوەی چەند رۆمانێکە کە دەتوانین بێژین، نەک هەر زمانی کوردییان دەوڵەمەند کردووە. بەڵکو لەڕووی فەرهەنگ و ناساندنی زاراوەکانی تری زمانی کوردییەوە، جێگەی رێز و قامک لەسەر دانانی تێکستەکانیانە، بە دیدی رەخنگرانەی تەندروست و مانادار.

رۆمانی (کۆچی سوور) نووسینی (حەمە کەریم عارف) یەکێک لەو رۆمانە کوردییانەیە، کە دەتوانین لە(ستراکتووری رەخنەی ئەدەبیدا، ئیعتیبار و حیسابی ووردی بۆ بکەین، ناونیشانی رۆمانی کۆچی سوور، بۆ خۆی پرسیارێکە، دەکرێت لەبەرایی ئەم باسەماندا قسەو باسی لەبارەوە بکەین، کۆچی سوور، لەو کاتەوە سەرهەڵدەدات کە (مستۆ) یەکێک لەپاڵەوانەکانی لەدوایین رستەکانی ناو رۆمانەکەدا دەبێتە قوربانی ناو کێشە ئاڵۆزەکانی دنیای شۆڕش، کۆچکردن بە تۆبزی و کوشتن بەدەستی غەدر، هەمیشە لەم جۆرە وێنەیەمان لەلا دروست دەکات، گومانێکە هەمیشە لەناو هزر و بیر و بۆچوونەکانماندا، جێگەی تایبەت بەخۆی هەیە، رۆماننووس تا دوایین رستە پشوودرێژانە، لەتەک پاڵەوانەکانیدا دەژی، بەجۆرێک لەزۆر شوێن و رووداوی ناو رۆمانەکەدا هەست دەکەین کە پاڵەوانێک لەدەرەوەی رۆمان، بەئەسپایی، وەک تارماییەک لەگەڵمان دەدوێت و

شوێن و وێنەکانمان وەک فۆتۆگرافێک نیشان دەدات، زۆرجار نووسەر خۆی وەک شارەزایەکی ناو شاخ و دەشتتاییەکان نیشان دەدات، توولە رێگەکان باش دەناسێت، دەزانێت پاڵەوانەکان خەڵکانی گوندنشینن، هەر بەو زمانە لەتەکیان دەدوێت.

گەر بەبازنەی مێژووی رۆمانی کوردیدا بچینەوە، دەبینین کە رۆماننووسێکی وەک (ئیبراهیم یۆنسی) لەو رۆماننووسانەیە کە سەرجەم رۆمانەکانی ناسراوە بە رۆمانی( گوندییانە یان شوانی)(Pastoral Novel) رۆمانی گوندییانە یان دێهاتی، شوێن گوندەکانە، واتە کۆی پاڵەوانەکان هەڵقوڵاوی ناو گوندەکانن، هەرچەندە ئەوە رۆماننووسە پاڵەوانەکانی لەتەک خۆیدا دەباتە ناو شارەکان و دنیایی دەرەوەی گوندییان پێ دەناسێنێت. وەک رۆمانەکانی (نزا بۆ ئارمێن، کلاّولار و قەرەچی، سەگوەڕ) بەشێکی زۆری رۆماننووسەکانی ئێمەی کورد، لەناو ئەم جۆرە رۆمانانەدا کاری جوان و داهێنانی دەگمەنیان کردووە، کە دەتوانم بڵێم کورد لە رۆژهەلاّتی ناویندا پێشەنگی ئەم جۆرە رۆمانەیە، رۆمانی (حەمە دۆک) نووسینی یەشار کەمال، رۆمانی (هەرەس) محەمەد موکری، رۆمانی (کەناڵی مەیموونە چەکدارەکان) کاروان کاکەسوور، رۆمانی (ژانی گەل) کە لەسەرەتایی بەشی شانزەی ناو رۆمانەکەدا، گوند گۆرەپانی ناو رۆمانەکەیە، رۆمانی (دەربار) بەشێکی زۆری پاڵەوان و شوێنی پاڵەوانەکان ناو گوندەکانە، خەسرەو جاف، بەجۆرێک دەئاخفێت، مرۆڤ سەرسام دەبێت بەو زمانە سیحرییەی کە لەناو زمان و ئاڵوگۆڕی زاراوەکاندا دروستی کردوون، وەکی دی تاکو ئێستا جۆری رۆمان لەلای ئێمەی کورد، جودا نەکراوەتەوە بەپێی ئەو ریزبەندییەی کە رۆژئاواییەکان دروستیان کردووە، بەجۆرێک کە هەموو رۆمانێک هەڵگری جۆرێک رۆمانە وەک (رۆمانی سۆزداریSentiment al Novel) رۆمانی (دەروونیPsycholgical Novel)

دەکرێت رۆمانی کۆچی سوور لەو جۆرە رۆمانە بێت کە بە رۆمانی دەروونی بناسێنین، رۆماننووس توانیویەتی هەموو کێشە دەروونییەکانی پاڵەوانەکانی ناو رۆمانەکە بە خوێنەر بناسێنێت، (کوڕم تۆ هێشتا بۆنی شیری خاوت لەدەم دێ. تۆو ئەو مەیدانە کوجا مەرحەبا! دنیا زۆری بە بەرەوەیە، کەسێ نەمرێ نۆرەی تۆش دێت، کوڕاو کوڕی تۆش)[٣] خوێندنەوەی ئەم جۆرە رستانە بەتەنیا ئامۆژگاریی و حاسڵکردنی پێشهاتەکان نییە بۆ پاڵەوانی ناو رۆمانەکە، بەڵکو ژیانی ئێمەی کورد بەردەوام خەیاڵمان، بیرکردنەوەمان، رەفتارمان، جۆرێک لەخولانەوە بەخۆوە دەبینێت، لەناو بازنەی کێشە سیاسیی و کۆمەلاّیەتییەکان،

ئەم بازنەیەش شێوازێکی ترسناکانەی لەتەک خۆیدا هێناوەتە بەرهەم، بۆ تاکەکانی کۆمەڵگە، ژیانی مرۆڤی کورد بەو جۆرەیە، هەرهەمووومان هەڵگری زمانی ئامۆژگارین، رەفتارمان تێکەڵ بەو کولتووورە بووە کە دەخوازین بچووکەکان گوێمان لێ بگرن، قسەکانمان نەوە لەدوای نەوە لەگوێ بگرن و زاکیرەیان پڕ بکەین لەئامۆژگاریی ئەو رۆژگارەی کە پێشتر تیایدا ژیاوین، گرێی دەروونی مرۆڤ لەو ساتەوە سەرهەڵدەدات کە مرۆڤ خاوەنی ئیرادە و بیر و رەفتاری خۆی نەبێت، هەموو لەحزەکانی ژیان گەڕانەوە بێت بۆ رابووردوو. حەمە کەریم عارف زۆر جوان پێکاویەتی کە خاڵی لاوازی مرۆڤی کورد، ئەو گرێ دەروونییە کە خودی تاکی کورد خاوەنی رەفتار و بیرکردنەوەی خۆی نییە، لەسەر ئەو مشتە قسانە ژیان بەڕێدەکات، کەخۆی خاوەنی نییە، بەڵکو بۆیان هەڵبەستووە، ئاخر مرۆڤ ئەو دەمانە خاوەنی ئیرادەی خۆیەتی کە گومان لە ژیان دەکات، پرسیار دەخوڵقێنێت، منەی ئەو رووداوانە دەکات کە دوورن لەحیکایەت و داستان، ئەزموونەکان تاقی بکاتەوە! (مستۆ) دەخوازێت کۆدەکانی شۆڕش بەرەو ئاکامەکانی ئینسانییەت ببات، وەلێ عەقڵی خێڵ و رەفتاری ناتەندروست، رێگرە لەبەردەم ویستەکانیدا، ئەو دەیویست ژیانی شاخ تەنیا تفەنگ نەبێت، ئەو دەیزانی (مەحمود) مرۆڤێکی ناشیرین و کائینێکی بێ ئینسافە، هەر زوو ئەزموونی ئەو جۆرە مرۆڤەی کرد کە حەز بە شکاندن و بچووکبوونەوەی مرۆڤەکان دەکەن، مەحمود پاڵەوانێکە خەباتگێڕ نییە، شەڕانگێزێکی لێهاتووە، وێڵی ئەو رۆحە شەهوانییە، کە سەراپا ژیانی داگیرکردبوو، مرۆڤێکە لەڕووی دەروونییەوە حەز بە کوشتنی مرۆڤە ئازا و پاکژەکان دەکات، دیسانەوە ئەمەش ئەو گرێ دەروونییەیە کە رۆماننووس خوڵقاندوویەتی، بەبڕوای من رۆماننووس دەبێت پاڵەوانەکانی لە رووی (زمان، ئەتەکێت، ئێستاتیکا، ئەخلاق) بنیاد بنێت، بەو جۆرەی کە لە رۆمانی کۆچی سووردا بەدی دەکەین. حەمە کەریم عارف، زۆر لەمێژە هەستی بەو راستییە کردووە کە نیشتمانێکی هەیە لێوان لێوە لەدەستی غەدر، نوقمی خەم و کارەساتەکانە، مەرجی هەرە گرنگی کۆمەڵگەی تەندروست، گرنگیدانە بە مەعریفە و دید و پێوانەی بیری تەندروست، ئەم مەرجانەش دەبێتە هۆی پێشخستنی گوزەرانی ئابووریی و سیاسیی و فەرهەنگی.

خاڵی گونجاوی سەرەنج ئەوەیە، کە بوونی کۆمەڵگە گرێدراوە بە پێشکەوتنی پەروەردە و فێرکردنەوە، کە دەتوانین نموونەی بەشێک لە وڵاتانی دنیا بە نموونە بخەینە ناوخنی ئەم باسەوە، کتێبی (ئێمیل) ژان ژاک رۆسۆ، لەو کتێبانەیە کە هەندێک لەمرۆڤە بەناوبانگەکانی دنیا لەسەر ئەم کتێبە فێرکراون و پەروەردە

کراون، خوێندن نەک تەنیا هزرمان فراوانتر دەکات، بەڵکو کلیلی کردنەوەی هەموو دەرگەکانی ئاسوودەیی کۆمەڵگەیە (ئێمیل مرۆڤەکان بە باشی دەناسێت، بەجوانی لێیان ورد دەبێتەوەو لەدەروونیان تێدەگات، ئەو بەزەیی بەو کەسانە دادێت کە دیلی هەڵە و شەهوەتەکانیانن) ئەمە ئەو شەڕە مۆراڵیی و عەقڵانییەیە کە رۆمانی کۆچی سوور، لەڕێگەیەوە هۆشداریمان دەداتێ و پێمان ئێژێت، پێشمەرگە، خاک، شەهید، خوێندن، بوونی ئیرادەی مرۆڤی کورد دەسەلمێنێت. حەمە کەریم عارف، دیدێکی رەخنەگرانەی نوێی لەناو رۆمانەکەدا خوڵقاندووە، کە هیچ کەسێک و هیچ رووداوێک پەردەپۆش ناکات و سەلیقەی وردی لە ئاست رووداوەکاندا چێکردووە. کۆچی سوور فرەناوەرۆکە، واتە خوێندنەوەی جیاواز هەڵدەگرێ، بۆ خوڵقاندنی چێژی رۆمان لە بەرامبەر خوێنەر و رەخنەگردا.

وێنە ( Image) ژیانی رۆژانەی مرۆڤەکان لە رێگەی بینینەوە، ریکۆردی شوێن و رووداوەکان دەگرێت و لەدید و پێوانەی خەیاڵەوە، رەنگ و هەموو شتەکانی تری ژیان گۆڕانیان بەسەردا دێت، وەکی دی ئەو چاوەی کە رۆماننسووێک وێنەکانی لە واقیعەوە دەگوێزێتەوە بۆ خەیاڵ و نووسین، جودایە لەو چاوەی کە مرۆڤێکی ئاسایی شتەکانی سروشتی پێ دەبینێت، چاوی رۆماننووسێک گەلێ جیاوازترە لە مرۆڤێکی ئاسایی، ئەو وێنەکان لەتەک رستەکاندا دەگرێت و دواجار لەناوەخنی دێڕەکاندا هەم وێنەکان دەبینین، هەمیش دێڕەکان دەخوێنینەوە، رۆمان بەتەنیا زمان و ئێستاتیکا نییە، بەڵکو رۆماننووس جیهانێک دروست دەکات، جودا لەو جیهانەی کە خەڵکانی تر دەیبینن، رۆماننووس جیهان بەڕستە بنیاد دەنێت، لەڕێگەی وشە و رستەی مانادارەوە شوێن و پاڵەوان و رووداوەکان دەدۆزێتەوە، رۆماننووسی بە ئەزموون ئەو رۆماننووسەیە کە دەتوانێ رستە و دێڕەکان، بە وێنە بۆ خوێنەر بکێشێت. رۆمانی کۆچی سوور، خاوەنی وێنەی نووسینە، حەمە کەریم عارف، لەبینینی شتەکانەوە دێڕەکان دەنووسێتەوە، وەک فۆتۆگرافێکی خاوەن سەلیقە، وێنەی پەیڤ و پاڵەوانەکان دەگرێت، وەک دەرهێنەرێکی شانۆیی، دیمەنەکان دەگۆڕێت، گەلێک لە دەرهێنەرە ناودارەکانی ئێستای سینەما و دراماو شانۆ ، ئیش لەسەر ئەم جۆرە رۆمانانە دەکەن، ژ بەر هەندێ، گەلێک لە رۆمانەکانی دنیا کراونەتە فیلم، ئەمەش سەلیقە و ئەزموونی رۆماننووسمان لەلا ئاشکرا دەکات (کە شەو رەشماڵی خۆی هەڵدەدا، وا دەزانی هەردوو شاخەکە ئەمبەر و ئەوبەری گوند دێنەوە یەک و باوەشی پێدا دەکەن تا لە چەپاڵەی زاڵمانی بپارێزن. کەس تەمەنی شاخەکان نازانێت، زۆر کۆنن، رەنگە شایەتی دەیان کارەساتی دڵتەزێن و لەهەمان کاتدا داستانی قارەمانێتی

بن. بەردی زل زل چنگیان لەبەرۆکی چیاکان گیرکردووە، زریان و باهۆز تۆف و باران، تەنانەت تۆپ و بۆمباش نەیتوانیوە تلیان پێبدەن و بەیەکجاری لەباوەشی چیاکانیان دەربێنن!) زیهنمان وێنەی دێرەکان دەگوازنەوە، بۆناو سروشت، وێنەکان لەدەرەوەی رۆمان، تابلۆیەکە لەگەڵ رووداوەکاندا لەجوڵە و جەرەیاندان، وێنەگرتنی خەیاڵ و واقیع ژیریی رۆماننووسمان نیشان دەدات، بە جۆرێک لەکاتی خوێندنەوە و بینینی وێنەکاندا ناتوانین چاوانی لەئاستدا بنووقێنین، ئاخر رۆماننووس هۆن هۆن فرمێسک بۆ مستۆ دەرێژێ، وێنەی ئەو دەستی غەدرە لەسەر سۆماکانی ون نابن، ئەمەیە ئەو کائینەی کە پاڵەوانەکانی خۆشدەوێن، رێزیان لێ دەنێت، بۆ ئەبەد لەبەر چاوی ون نابن.

هەندێک لەشاعیرانی ئێمە، شیعرەکانیان خاوەنی وێنەی شیعری رۆمانئامێزن، تژین لەخەیاڵ و تەکنیکی گێڕانەوەی رۆمان، گەر چاوێک بە شیعرەکانی (شێرکۆ بێکەس، قوبادی جەلیزادە، کەریم دەشتی، دلاوەر قەرەداغی) بگێڕین، دەبینین رستە شیعرەکانیان لێوانلێون لەخەیاڵ و لەوێنەی رۆمان، حەقیقەتی رۆمان ئەوەیە وێنەکان خاوەنی جوڵە و رستەی وێنەین، شاعیرەکان، گەلێ لە رۆماننووسەکان دەوڵەمەندتر و خەیاڵیان فراوانترە. کاری شاعیر جوانکردنی خەیاڵە بە رستەی کورت و مانادار، بەڵام کاری رۆماننووس تێکەڵکردنی واقیعە بۆ ناو خەیاڵ.

رۆمانی هوتێل ئەورووپا، نووسینی فەرهاد پیربال، رۆمانێکی(کۆمەڵایەتی) یە (NovelSociological) کە تاکە رۆمانی کوردییە کە لەبەر یەککەوتنی ئایین و ئایدۆلۆژیادا، جۆرێک لەنزیکبوونەوە لەنێوانیاندا دەخوڵقێنێت، ئایین عاشقی ئایدیۆلۆژیایی چەپ دەبێت، بەجۆرێک کە چیدی هیچ بەربەستێک نامێنێتەوە بۆ دامرکاندنەوەی ئەو حەزەی کەوتە نێوان (هومەیلا و محەمدی حاجیزادە)ەوە فەرهاد پیربال لەو رۆماننووسانەیە، کە دەخوازێت لەرێگەی رۆمانەکانییەوە، کێشە کۆمەڵایەتی و سیاسیی و رۆشنبیریی و هونەرییەکان، چارەسەر بکات، بەئانقسەت شەڕی دەق لەگەڵ دەقدا چێدەکات، دروستکردنی شەر لەتەک دەقدا فەزایەک دەخوڵقێنێ بۆ ئەوەی خوێنەر پەلکێش بکات بۆ ناو ئاخافتن و هونەری گێڕانەوەی رۆمان، ئەم جۆرە ئیشکردنە لەناو رۆماندا، کارێکی تازەو دەگمەن کارە، حەوسەڵەکردن لەگەڵ کارەکتەرەکانی ناو رۆمان، ژیریی رۆماننووسمان بۆ دەخاتە روو، واتە رۆماننووس ئەو مەخلوقەیە کە خۆ دەپارێزێت لە درێژ دادڕی و لوولپێچی رووداو کارەکتەرەکان، فەرهاد پیربال دەروونناسێکی شارەزایە، پاڵەوانەکانی لەناو واقیعەوە هێناوەتە ناو فەنتازیایی رۆمانەوە، کارکردن لەسەر

بیرکردنەوە و جۆری رەفتاریی پاڵەوان لەناو رۆماندا، کارێکی نوێمان وەک شانۆیەک بۆ نمایش دەکات، ئەو لەزاری محەمەدی حاجیزادەوە کۆدەکان ئاشکرا دەکات (نامەم بۆ دەنێرێت و دەڵێ، کچەکەت ئێستا گەورە بووە و چاوەڕێت دەکات. هەر کاتێک مافی پەناهەندەیت بۆ دەرچوو، بەدوای ئێمەشدا بنێرە و دێین بۆ لات. حەز دەکەین لەگەڵ تۆ پێکەوە بژین)، خوێندنەوە و شیتەڵکاریی کارەکتەر لەڕووی دەروونییەوە ئەو راستییە دەسەلمێنێت کە پاڵەوانەکان خوڵقێنەری بیر و عەقڵێکی کراوەو زیندوون، کە رۆماننووس دروستی کردوون. رۆمانی کۆمەڵایەتی شێوازێکە لە رۆمانی سیاسیی، بەڵام هیچ کات ئەم سیاسیی بوونە، نابێتە رۆمانی بیروباوەڕی و پڕوپاگەندەیی، نووسەر کێشە کۆمەڵایەتییەکان، لە چوارچێوەی عەقڵ و پەیوەندییەکانی ناو خودی تاکەکانی کۆمەڵگە رووەو چارەسەر دەبات، فەرهاد پیربال لەدیدی پاڵەوانەکەیەوە ژیان وێنا دەکات. ژیان گوزەرێکە بەناو پێکەنین و گریاندا، مرۆڤەکان لەسەرەتایی دروستبوونیاندا بە گریان پێشوازی لەژیان و لەکەسەکانی دەورووبەریان دەکەن، گریان بۆ خۆی هەندێجار جوانییەک دروست دەکات، کەتەنیا مرۆڤە عاقڵەکان لێی حاڵی دەبن، گەر گریانیش نەبوایە پێکەنین دروست نەدەبوو، تێکەڵکردن و بەرکەوتنی دووجۆر عەقڵ، ناساندن و شکاندنی ئەو جۆرە رەفتارەیە کە هەڵگری عەقڵێکی (Demagoge) دیماگۆگییە. رەفتاری دیماگۆگی هەڵگری جۆرە ژەهرێکە، حەزەکانی مرۆڤ، لەناوەوەی ویستەکانی خۆیدا دەخنکێنێت، واتە شەڕ لەتەک ویستەکانی ناوەوە و دەرەوەی مرۆڤدا. رۆمانی هوتێل ئەورووپا، لەناو دوو جۆر رۆماندا دەبینینەوە، وەک رۆمانینامەکاریی (EpistolaryNovel) رۆمانی نامەکاریی، لەو جۆرە رۆمانانەیە کە لەناو دەقی رۆماندا، کار لەسەر خستنە رووی کێشەکانی ناو خودی رۆمان دەکات، مۆدێلەکانی دین و ئایدیۆلۆژیا تێک دەشکێنێت، بەتایبەت ئەو کاتانەی کە رووداوەکان بەرەو شڵەژان و بەریەککەوتنی کارەکتەرەکان دەبنەوە، زووربەی جارەکان رۆماننووس نامەکان لەو کاتانەدا دەخاتە روو، کە خودی دەق ئامادەگی هەیە بۆ نووسین و وەڵامی نامەکان. محەمەدی حاجی زادە، لە سەرەتایی رۆمانی هوتێل ئەورووپادا، دەکەوێتە ناو گێڕانەوەی نامەکەی هومەیلاوە، ئیدی لێرەوە خوێنەر لەتەک خۆیدا دەباتە گشت ئەو جێیانەی کە رووداو تیایدا بەریەک دەکەون.

حەز دەکەم یەکێک لەوێنە جوانەکانی رۆمانی (گۆڕ غەریب) بخەمەڕوو، کە شەرێکە نووسەر لە بەرامبەر فەلسەفەدا، دەیخوڵقێنێت و پرسیاری ئەوەمان لێدەکات (حیکمەتی جوانی ژیان لەکوێدایە؟)، ئەم پرسیارە هەڵگری دونیایەک

تەفسیری فرە جودا لەگەڵ خۆیدا دێنێتە قسان و ناچارمان دەکات، بچینەوە بەناو گشت ئەو میتۆدانەی کە بوونەتە هۆی جوانکردنی ژیانی مرۆڤەکان، ئەی چی وادەکات ژیانی مرۆڤەکان بێئومێد و نائاسوودە بێت لە ژیاندا؟ کاتێک مرۆڤ توشی ئەو حاڵەتە دەروونییە دەبێت کە ژیان مانای نییەو چیدی شتێک نییە پێی بووترێت ئاسودەیی، ئیدی ئەوجا تەمێکی رەش سەراپا هەست و هۆشمان داگیر دەکات و ژیانمان لێ دەبێتە دۆزەخ نەک فیردەوس، لەخۆڕا نییە (گۆڕ غەریب) تووشی ئەم تەمە غەریبیە دەبێت و پرسیار و باسی جوانی ژیانمان لێدەکات و ئێژێت (ئەسینا شیعرێکە بە مانای وشە تۆی رێبوار و غەریبە، دەتوانیت شەقام بە شـــەقام باخـــچە بـــە باخـــچە بیخوێنیتەوە، دەتوانی بۆنی گوڵە (ئەسخیلۆس)ییەکان بکەیت، دەتوانی بە دار عیرفانی (پلاتون)دا سەرکەویت، سەیری جوانییەکانی (ئەنتی گۆنا) بکەیت، لە تەنیشت پەیکەری (سوکرات) راوەستاویت و وێنە بگریت، دەتوانی یادگارەکانت ببەیتە سەرکێوی (ئەکرۆپۆلی) لاسایی قوتابییەکانی پلاتون بکەیتەوە. گوێ لەهاژەی برینەکانی رۆح بگریت، ئێمە وامان کرد تابزانین فەلسەفە چییە؟ حیکمەتی جوانی ژیان لەکوێدایە، لەچییدایە؟) ئەم وێنەیەی نووسەر دێڕێکی ئایریس مێردۆک دێنێتەوە یاد(ئەدیب بە ئەنقەست فەزایەک بۆ گەمەی خوێنەر بەجێدێڵێت، وەلێ فەیلەسوف نابێ هیچ فەزایەک جێبێڵێت).گەمەی ئەدیب نەشئە بە زمان و جوانی دەق دەبەخشێت، لەرووی هێڵی پارادایم و خوڵقاندنی ئێستاتیکای رووداوەکانی سەرەتاو ناوەڕاست و کۆتایی و بەستنەوەیان بە پاڵەوانەکانی ناو دەق و باسە مێژوویی و واقیعییەکانی ناوەوەی نووسینە ئەدەبییەکان.

رۆلان بارت وتەنی (نووسینی ئەدەبی لەناوەوەی خۆیدا هەم هەڵگری لەخۆ بێگانەبوونی مێژووە و هەم هەڵگری روانینی مێژووە)، نووسەری گۆڕ غەریب بە تەنیا خاوەن قەڵەم نییە، بەڵکو فۆتۆگرافێکی سەرکەوتووە لە وێنەگرتنی شاری ئەسینا و شەقامەکانی، ئەوەتا بە چاوی خەیاڵەوە گشت شوێنە سەرنجڕاکێشەکانی شاری ئاتێن دەگرێت و باخچە و گوڵەکانی شانۆی شار، مرۆڤە خاوەن ئیدراکەکانی وەک (پلاتون، ئەسخیلۆس، سوکرات، ئەنتی گۆنا)و هەموو موزیکژەنەکان دەگرێت و لەچاوی قەڵەمەوە نیشانمان دەدات. ئەمە وامان لێدەکات کە بڵێین عەبدولقادر سەعید فۆتۆگرافێکی لێزان و بەسەلیقەیە لەچاوی نووسینەوەی رۆمانەکانی (کۆچی سوور، هوتێل ئەورووپا، دەربار، سەگوەڕ، گۆڕ غەریب، ژانی گەل)، ئەو دەقە زیندووانەن کە خاوەنی شوێن و زەمەنی خۆیانن، خوێنەر بەسانایی شوێنەکان دەبینێت، ئاشنا دەبێت بەکارەکتەرەکان. جگە لەوەی

ئەم ڕۆمانانە لەڕووی زمان و فۆرم و ئێستاتیکاوە شوێنیان دیارە، بەهەمان جۆر بەیەخێکی گرنگیان لەناو کتێبخانەی کوردییدا هەیە بۆ خودی ڕماننووسەکان و خوێنەری کورد. گادامێر وتەنی (تێگەیشتن پێش هەموو شتێک پێکهاتنە) لەبەرایی ئەم باسەدا بەرەوو ڕووی کۆدێک بووینەوە کە قورمیشکردنی خوێنەرە، ئەم قورمیشکردنە بەتەنیا یەک جۆر لەخۆناگرێت، بەڵکو خولقاندنی دوو جۆر قورمیشکردنە، یەکەمیان قورمیشکردنی ئایدیۆلۆژیا، دووەمیان، قورمیشکردنی نووسەرە، هەردووکیان کار لەسەر فراوانکردنی خوێنەرەکانی خۆیان دەکەن، هەر یەکەیان بە ستایڵ و دەمامکی شاراوە، خوێنەر بۆ نووسینەکانیان مسۆگەر دەکەن. لەڕێگەی تەکنیکی نووسینەوە خوێنەر دەبێتە ئەدەواتی نووسەر. ئەمەش جۆرێکە لەخاڵیبوونەوەی ئەتەکێتی نووسین. لە بەرامبەر مۆراڵی نووسیندا. نووسین بۆ خۆی جۆرێکە لە ئەخلاق، بەرپرسیارێتییەکە نووسەری خاوەن ئیرادە خاوەنییەتی!

**خێزگەکان:**

١- ڕۆمانی کلاولار و قەرەچێ نووسینی ئیبراهیم یۆنسی، وەرگێڕانی ئەحمەد مەولانی.

٢-خۆزێ ساراماگۆ چاوپێکەوتن، لەڕۆژنامەی (Die Zeit)ی ئەڵمانی، ٢٠٠٨

٣- ڕۆمانی کۆچی سوور، نووسینی: حەمە کەریم عارف ١٩٨٧ .

٤- ئێمیل، ژان ژاک ڕۆسۆ، وەرگێڕانی ڕەسوڵ سوڵتانی.

٥- ڕۆمانی دەربار، نووسینی خەسرەو جاف.

٦- ڕۆمانی ژانی گەل، نووسینی ئیبراهیم ئەحمەد.

٧- ازدواجیە العقل، دراسە تحلیلیە نفسیە لکتابات، حسن حنفی- جورج طرابیشی.

٨- مدرنیتە و اندیشەی انتقادی، بابک احمەدی، چاپ چهارم، ١٣٨٠ .

٩- أنواع الروایە . ویکیبیدیا الموسوعە الحرە.

# کەسایەتی لە چیرۆکی (خەونامەکەی دانیال پێغەمبەر)ی جەلیل کاکەوەیس-دا

عەلی شێخ عومەر

## دەستپێک

لەگەڵ گەشەسەندن و پێشکەوتنی کۆمەڵ، پێداویستییەکانی مرۆڤ روو لە زیادبوون دەکات، بێگومان رەنگدانەوەی ئەمەش شێواز و جۆر و تۆڕی پەیوەندییەکانی مرۆڤی بەرەو ئاڵۆزی و نا روونییەک بردووە، هەر لە سۆنگەی گۆڕینی ئەم پەیوەندییانەدایە چەمکەکانی تێگەیشتنیش گۆڕانکارییان بەسەردا دێت، ئەمەش گشت بوارەکانی دەگرێتەوە، ئەوەی ئێمە مەبەستمانە لێرەدا، ئەدەبە، ئیشکردنە لەمەڕ رۆڵی کەسایەتی لەنێو چیرۆکدا. بەرایی راوبۆچوونێکی زۆر لەسەر کەسایەتی هەیە، بەڵام یەکێک لە پێناسەکانی کەسایەتی ئەوەیە کە دەڵێت (کەسایەتی یەکێکە لە ئامرازەکانی ناو پێکهاتەی گێڕانەوە، گشت کارەکانی گێڕانەوەی سەر زارەکی لەگەڵیدا هاوبەشە، وەک حیکایەتی خورافی، نووسراو، چیرۆک و رۆمان...)[1]. کەسایەتی لە دەربڕینی مەبەستەکانیدا تاقانە نییە، گەلێ جار بەیارمەتی ئامرازی جیاوازەوە دەتوانێت گوزارشت لە خۆی بکات، گرتەی وێنە درامییەکان بکێشێت، بە شێوازی کەس لەتەک کەسدا، کەس لە بەرامبەر شوێندا، کەس و هزر، کەس و ئایدیۆلۆجیا، تێڕوانینی کەس بەرامبەر بە ئەوین، بەرامبەر بە بوون و شوێنکات و پێگە و رەنگدانەوەی لە دەروون و هەڵسوکەوت... هتد. لە رۆمان و چیرۆکدا دەشێ کەسایەتی خاوەن جۆرەها رێباز و بیرۆکە و خەیاڵ بێت و زەمینەیەکی شارستانی هەبێت و هەڵگری

خەم و خەون و ئازاری سەردەمەکەی بێت. بەلزاک یەکێکە لەو رۆماننووسانەی کە دەتوانێت بەوپەڕی ئەمەکەوە رەنگدانەوەی ژیانی ریالیستی سەردەمەکەی بە ورد و درشتەوە، کەسایەتییەکان، کۆمەڵگا و ژیانی رۆژانە و خەمەکانیان، وەکو خۆی بگێڕێتەوە. بەدواچوونی چیرۆکنووس بەدوای کەسایەتییەکانیدا و دیاریکردنی پەیوەندییەکانی لە رێگای گێڕانەوەدا، شێوازێکی بچووککراوەی ریاڵ بۆ وەرگر فەراهەم دەکات، وەلێ تێوەگلانی دەسەڵاتی چیرۆکنووس لە تەک کەسایەتیدا و ریزبەندی رووداوەکان بەم سکێچە، دەکرێت کەلێنێک بخاتە ناو جەستەی ئەدەبەوە، بەتایبەت لە ئاستی چیرۆک و رۆماندا، بەوەی بێبەش کراون لە رەگەزەکانی خەیاڵ و فانتازیا. گەر چیرۆک و رۆمان سروشتی خەیاڵی تێدا نەبێت، تەنیا گوزارشت لە ژیانی ریاڵ بکات و سەپاندنی دەسەڵاتی بنووسیش لەسەر کەسایەتی و رەوتی رووداوەکان ئاراستەیەکی دیاریکراوبێت لەنێو پێدراوەکانی ریاڵدا، ئەوا بەرەورووی مێژوو دەبێتەوە، هەوێنی پرسیارێک دەگرێتەوە، ئایا رۆماننووس مێژوو دەنووسێت، یان ئەدەب؟ پێگەی ئەدەب لە مێژوودا چییە، یان بە پێچەوانەوە؟ ئەمەش یەکێکە لە قەیرانەکانی رۆمان و چیرۆکی تەقلیدیی، ئەمە بێجگە لەوەی رۆڵی کەسایەتی تەقلیدیی لە گەمەکانی گێڕانەوە لە کێشەیەکی بەردەوامدایە، هەر لە گرێچن و زمان و پێگەوە بیگرە تا دەگاتە رووداو، هەروەها پێکهاتەی گێڕانەوە لە رۆمان و چیرۆکی تەقلیدیدا پابەندە بە لۆژیکەوە، پێداگرە لەسەر قەدبڕی و بەستنی یەک بەدوای یەکی شتەکان و هیچ رووداوێک روونادات گەر نەبەسترابێت بە هۆیەکەوە، یان بە جووڵەیەکەوە، یان بە سۆز و ئارەزوو، یان بە پاڵنەر، یان بە کەسێکەوە، لێرەدا نووسەر پێشەنگی کەسایەتییەکەیە و هەموو شتێک دەربارەی شوێن و شوێنکات و رووداو دەزانێت، کەس بوونەوەرێکە و هەبوونێکی میتافیزیکی هەیە لە (دەنگ، رەنگ، رووخسار، تەمەن، حەز و خواست...)[2]، نموونەی ئەو نووسەرە دیارانەی کە بەم شێوازە دەنووسن (بەلزاک، ئەمیل زۆلا، نەجیب مەحفوز). هەندێ نووسەر لە سەرەتای جەنگی یەکەمی جیهانییەوە تا دەهات هەڵوێستیان بەرامبەر بە شاکەسی رۆمان و چیرۆکەکان سەختتر دەبوو، وەک کەسێکی ناوەکی خوێندنەوەیان بۆ نەدەکرد بەوەی (کەسە یان تاکمەندە)، ئەمان لە قاوغێکی ئاماژەپێدراودا خوێندنەوەیان بۆ کەسایەتی دەکرد، چونکە کەسایەتی تەنیا شێوەیەکە لە رەگەزەکانی زمان، چەشنی گێڕانەوە و دیالۆگ، سەرەتای رۆمانی نوێ بە رۆمانی (دادگە)ی (فرانز کافکا)وە دەستی پێکرد، لەم رۆمانەدا لەبری ناو، ژمارەی بۆ کەسایەتییەکان دانا، بەم پێیەش شووناسیان لێ زەوتکرا و لە سۆز و بیرکردنەوە و لە

دابونەریتە باوەکان دابڕانێکی دروستکرد، بۆ پەیوەندی شەرعی نێوان کۆمەڵگا و ڕووناکبیری (لە سەردەمی جێمس جویسەوە هەتا بیکیت خەسڵەتی نەبوونی ڕەها هەیە لەنێوان سیستم و بەرهەمهێنان و بیرۆکەی خودی مرۆڤ...)[٣]، زۆربەی ڕەخنەگرە فەڕەنسی و ئەمریکییەکان لەسەر ئەوە کۆکن کە کەسایەتی دابڕاوە، یاخود دەبێت داببڕێت لە نرخ و بەهاکانی کۆمەڵگا، هەندێ نووسەر دیاریکردنی باری کۆمەلایەتی و دەروونی لە کەسایەتی ڕەت دەکەنەوە، لەوانە: جێمس جویس و فرجینا ولف، لەڕاستیدا بۆچوونەکانی ئەمان دەرباری کەسایەتی لەنێوان ڕۆمانی تەقلیدیی و ڕۆمانی هاوچەرخدا ڕایەکی مامناوەند بوون، هەتا لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمدا مەرگی کەسایەتی ڕۆمان لەلایەن (ناتالی سارۆت، میشل بیتور، کلۆد سیمۆن، سامۆئیل بیکیت، ولیام بێردگسن)ەوە ڕاگەیەنرا، ئینجا ڕۆلان بارت کەسایەتی ڕۆمانی کردە پاڵپشت تا گەمە نەک لەگەڵ خۆیدا، بەڵکو گەمە لەگەڵ ئێمەدا بکات (وەک بڵێیت لەنێوان گووتار و کەسایەتیدا هاوکۆکییەکی توند هەیە...)[٤]، ئەمەش لەسەر بنەمای سۆزیاری بۆ زیندگی و شت و نواندنی ستاتیکییە، تا لە ئاکامدا پەیوەندییەکی ئاڵۆزی دروستکرد لە دۆزینەوەی سامپڵە بێ کۆتاییەکان، وەک ئەوەی کەسایەتی سامپڵی گووتار بێت، کەواتە دژوار نییە کەسایەتی یەکسان بێت بە گووتار، کە پێکهاتەی زمانی دەقە و کەسایەتیش لە ڕخنەی تەقلیدیدا گشت شتێکە.

## پەیوەندی جێناو بە کەسایەتییەوە (کاراکتەر)

سیحر و لەزەتی دنیایی نووسین هاندەرێکی چاکن بۆ پەڕینەوە لە ئاستەنگەکانی نووسین، ئەویش لە ڕێگای گێڕانەوە، کاریزمای ئاسانترین شێواز دەگرێتە بەر، بۆ چوونە ناو جیهانی کەسایەتییەکانییەوە، بۆ ئەم مەبەستەش دەکرێت لەبری ناو، جێناو بەکاربهێنێت بۆ ئەفراندنی ئەو مەبەستەی کە خولیای سەلماندنییەتی تا لە ڕەوتی ڕووداوەکاندا وەرگر بەشدار بکات. بێگومان ئەم جێناوانە لە شوێن و کاتی خۆیاندا کە وەک تاک بەکاردەهێنرێن، بریتین لە (من، تۆ، ئەو)*، وەک کۆش بریتین لە (ئێمە، ئێوە، ئەوان) کە بە مەبەست و ئامانجی دیاریکراو لەسەرێکەوە کارڕایی دەکەن و دێنە نێو شوێنکات و گووتار گێڕانەوە، لە سەرەکەی تریشەوە لە تەک جووڵە و پێکهاتەی کەسایەتییەوەن، ئێستا بە کورتی با بزانین ئەو مەبەست و ئامانجانە چین کە جێناو تێیدا بەکاردەبرێت:

١-جێناوی (من)ی قسەکەر، خاوەن توانایە لە توانەوەی جیاوازییەکانی شوێنکات و گێڕانەوە و نێوان بگێڕەرە و کەسایەتی زۆربەی کاتەکانیش سەنتراڵ

نییە، ستاتیکای ئەم جێناوە ئاوێتەیە بە گیانی نووسەرەوە، لەمپەری لەسەر شوێنکات لادەبات، وا وەرگر بە کاری گێڕانەوەوە دەبەستێت، کە وا تێدەگات نووسەر بەڕاستی یەکێکە لەو کەسایەتییانەی کە رۆمان، یان چیرۆک بەڕێوە دەبەن، ئەمەش بەگوێرەی وەرگر، سڕینەوەی رۆڵی نووسەرە بێئەوەی هەستی پێ بکات. جێناوی (من) وەک ئەوە وایە جێگای خود بگرێتەوە، لەکاتێکدا جێناوی نائامادەی (ئەو)، شوێن یان بابەت دەگرێتەوە، ئاراستەی (من) ناوەکییە و روو لە خودە، پێچەوانەی ئاراستەی (ئەو)ی دەرەکییە، جێناوی (من) دەمێک لە ناوەوە دەردەچێت و بۆ ناوەوە دەگەڕێتەوە، دەمێک لە ناوەوە دەردەچێتە دەرەوە، بەڵام جێناوی (ئەو) دەمێک لە دەرەوە دەردەچێتە دەرەوە، دەمێک لە دەرەوە دەردەچێتە ناوەوە، شوێنکات لەناو شوێنکات، کەس لەناو کەسایەتی، رووداو لەنێو رووداودا دەتوێنێتەوە، رۆلان بارت واتەنی (جێناوی قسەکەر کەمتر شیاوی رۆمانە وەک لە جێناوی نائامادەی ئەو...)[٥]، ئاراستەی جێناوی (من)ی قسەکەر پتر بەکاردێت بۆ لەمپەرێک، یان رابردوویەکی نزیک.

٢-جێناوی (ئەو)، زۆر بەربڵاوە لە گێڕانەوەی سەرزارەکی یان نووسراو، ئامرازێکی بەکەڵکی گێڕەرەوەیە، هزر و ئایدیۆلۆژیا و رێنمایی و بیروڕا دەتوانێت بەناویدا تێپەڕێت، زۆر کەرت نووسەر بۆ خۆپاراستن جێناوی (ئەو) بەکاردەهێنێت هەتا نەکەوێتە نێو تەڵەکانی (من)ی قسەکەر، کە دەشێت لەگەڵ کرداری گێڕانەوەدا بەرەو ناحاڵیبوونێک بەکێشمان بکات، بەهەرحاڵ بۆ پەیبردن بە کەسایەتییەکان و بەردەوامبوونی کردەی رەوتی گێڕانەوە، نووسەری دەستڕەنگین هەوڵدەدات (من)ی بگێڕەوە لە (من)ی نووسەر جیابکاتەوە، بۆ ئەمەش بەکارهێنانی جێناوی (ئەو) رێگاخۆشکەرە و دەرمانی نووسیارە، مۆریس بلانشۆ گووتەنی (جێناوی نائامادە نەمانی کەسایەتییە کە خۆی لە پلەیەکی نێگەتیڤدا دەنوێنێت)[٦].

٣-جێناوی (تۆ) لەنێوان جێناوی (من)ی قسەکەر و جێناوی (ئەو)ی نائامادەدایە، حەزی نە لە ناوەوەیە، نە لە دەرەوەیە، بەڵکو لە ناوەڕاستیاندایە، لە بنەڕەتدا ئەم جێناوە بۆ تەرازاندنی گرێی دەروونی و نیرۆسییەتی (من)دا بەکاردەهێنرێت، وەک لە روانگەی میشێل بیتۆر کە دەڵێت (تۆ رزگارکەری منە)[٧]. لە کۆتایی ئەم روونکردنەوە کورتەدا هیچ نەماوە بگوترێت لەوە زیاتر کە دەڵێت: (ئەم سێ جێناوە لای گێڕەرەوە پتر بابەتێکی ستاتیکییە، نەک ئاماژەیی، شێوەخوازە نەک بنەڕەتی، پەسەندکراوە، نەک بە تۆپزی)[٨]. ئێستا دەکرێت بەشێوەیەکی کورت جۆرەکانی کەسایەتی دیاری بکەین کە پێکهاتووە لە کەسایەتی (سەرەکی، لاوەکی، خڕئامێز، رووکەشی، پۆزەتیڤ، نێگەتیڤ، جێگر، پێگەیو).

هەندێ لەو بابەت و قسانە کە بە مەبەستی روونکردنەوەی رێسای کەسایەتییە، کە پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد، لێرەوە هەوڵدەدەین رۆڵی کەسایەتی لە چیرۆکێکی (جەلیل کاکە وەیس)دا پیادە بکەین، جەلیل کاکەوەیس لە هونەری چیرۆکنووسیندا ئەزموونێکی کەمی نییە، یەکێکە لەو ناوە دیارانەی کە بە شێوازێکی تایبەتی دەتوانێت وەرگر تێکەڵ بە جیهانەکەی بکات، لە رێگای گێڕانەوە و ریزبەندی رووداوەکاندا، دەتوانێت کەسایەتی (کارکتەر)ەکانی لە شوێن خۆیدا بجووڵێنێت، مەبەست بپێکێت، هەندێ جار بە شارەزاییەکی تەواوە تێکەڵ بە جیهانی کەسایەتییەکانی دەبێت، دوور و نزیک پەیوەندی لەگەڵ کەسایەتییەکانیدا پەیدا دەکات، لە زۆربەی چیرۆکەکانیدا ناتوانێت خۆی لە رەهەندەکانی مێژوو قووتار بکات، بەتایبەت لە رێگای گێڕانەوەی رووداوەکاندا وەک شایەدحاڵ رۆڵی کەسەتییەکانی دەخاتە سەر مینبەر، هێنانی کەسایەتی (کاراکتەر) بۆ سەر دووڕیانەکانی مێژوو لەژێر رۆشنایی کۆکردنەوەی بابەتی رووداوەکاندا، زۆر کەرت لە رێگای کارتێکردنی رەهەندەکانی مێژووی سیاسی گەلەکەیەوە کاراکتەر لە تەمەن و رووخسار و ئاستی کۆمەڵایەتی و چینایەتی بێبەش دەکات، ئەمەش لە دەرئەنجامی هەستکردنە بە سڕینەوەی ناسنامەی کەسایەتی کورد لە نەبوونی پێگەی سیاسی، رەشبردنەوەی متمانەیە لە کەسایەتی تاکی کورد بەرامبەر لە ئاوڕنەدانەوەی مێژوو، یان کەڵک وەرنەگرتنی هەژموونی رووداوەکانە، کە گۆڕانکاری بەسەر تاکی کوردا ناهێنێت و بە درێژایی مێژوو نەیتوانیوە بیقۆزێتەوە و سوودی لێ وەربگرێت. جەلیل کاکەوەیس لە رێگای هونەری چیرۆکەوە لە زمانی کەسایەتییەکانییەوە دەیەوێت هەندێ لەو وێنە و رووداوانە زیندووبکاتەوەو لە شوێن و کاتی گونجاودا جەستەی دەقی پێ ساڕێژ بکات. ئینجا با بزانین چیرۆکنووس چۆن دەتوانێت خۆی بهاوێتە ناو کەسایەتییەکانەوە و دەتوانێت خۆیشی لێ دەرباز بکات، یان هەردووکیان لە رستەیەکدا کۆبکاتەوە، بۆ پیشاندان و قسەکردن لەسەر چەمکی کەسایەتی دەکرێت لە چیرۆکی (خەوننامەکەی دانیال پێغەمبەر)[٩]ەوە بچینە نێو باسەکەمان.

## (خەوننامەکەی دانیال پێغەمبەر)

(ماوەیەک بوو کەوتبوومە خولیای ئەو خەونە زۆرانەی کە دەمبینین، هەر خەونێکیشم دەبینی بەدوای خەوننامەیەکدا دەگەڕام، تا خەونەکەم لێکبدەمەوە و لە نوقڵانەی شووم رزگارم بێت...)[١٠]، ئەمە دەسپێکی چیرۆکەکەیە، کە بە جێناوی (من)ی قسەکەر شوێن و کاتی گێڕانەوە لەنێوان بگێڕەرەوە و (کارکتەر)ی

چیرۆکەکەدا دەسرێتەوە، وەرگر وابەستەی کردەی گێڕانەوە دەکات، بەوەی کە حیکایەتخوان خودی چیرۆکنووس خۆیەتی و رەوتی رامکردنی رووداوەکان لەئەستۆ دەگرێت، هەر لە یەکەم ساتەوە وەرگر دادەکوتێت و دەیخاتە بەردەم قەیرانی دووانەیەک کە لە سەرێکەوە خەون دەکاتە ئەڵتەرناتیڤی ریاڵ لە سەرەکەی تریشەوە بۆ لێکدانەوەی خەونەکان ئێستای ریاڵ دەکاتە ئەڵتەرناتیڤی رابردوو و پاشینەی خەونەکەی کە سەردەمانێکە گیرۆدەی بووە و دووبارە و چەندبارە دەبێتەوە، ناتوانێت خۆی لێ دەرباز بکات، لە سۆنگەی فشاری ئەو داکەوتانەی کە ریاڵ لە دەرەوەدا سەپاندوویەتی بەسەریدا و ناتوانێت وەڵامی بۆ بدۆزێتەوە، لەناو خودیشدا وەک پەرچدانەوەیەک خۆی دەخواتەوە، وەک نیشتەمەنییەک لە چینە قوڵەکانی نەستیدا بەشێوەی خەون رەنگدەداتەوە، پشتبەستن بە کردەی خەوبینین نەک کەسایەتی کارا بەرهەم ناهێنێت، بەوەی ئیش لەسەر لابردنی ئەو دەرکەوتانەی ریاڵ ناکات، بەڵکو کارکتەر لە کەسایەتی دادەبڕێت، وەک کردەوە هیچی پێ ناکرێت بە دانپێنانی حیکایەتخوان خۆی، کە ژیانی کردووەتە رۆمانێک بێئەوەی هیچ رۆڵێکی تێدا بگێڕێت (شاکەسی رۆمانەکەش پتر لە خەونبینین ناپەرژێتە سەر هیچ شتێکی دی)[11]. چیرۆکنووس بەوەندەوە ناوەستێت و دەیەوێت بە رێچکەیەکی پراکتیکی، بە گریمانەیەک کە لە دەنگی ئافرەتێکەوە سەرچاوەی گرتووە، بۆچوونەکەی بسەلمێنێت (لەناکاو گوێم بە دەنگی سۆزناکی ئافرەتانە زرنگایەوە، میران فریام بکەوە چەندین رۆژ کچە تاقانەکەم لێ ونبووە و بۆم نادۆزرێتەوە)[12]، کاراکتەری سەرەکی کە ناوی (میران)ە، کە چیرۆکنووس خۆیەتی، لە رێگای کەسایەتییەکی لاوەکییەوە کە لە دەنگی ئافرەتێکەوە خۆی و جیهانی ناوەوەی خۆیمان پێ دەناسێنێت. وەلێ لەگەڵ دەرکەوتنی دەروازەی ئەو جیهانە، جەلیل کاکەوەیس گەمەی خۆی دەکات، زیرەکانە پەردە لەسەر دابەشکردنی ئاستەکانی جووڵانەوە لادەبات، بۆ ناوبڕێک لە پنتێکی شپرزەدا وەرگر تووشی شۆک دەکات بە قرتاندنی ئەو داوە تەلیسماوییەی کە جیهانی دەرەوە گرێدەدات بە جیهانی ناوەوەی کەسایتییەکە، کاتێک کەسایەتی (میران) لەپڕ بە سەهوو بانگ لە پیرەژنێکی دیانی پرچ چەرمۆ دەکات و پێی دەڵێت: (ئەوە تۆ بوویت بانگت کردم)[13]، ئەم ساتەوەختە خاڵێکی وەرگەڕان و ئاگادارکردنەوەیە بەوەی تەوەری خەیاڵ و خەونەکانی دەپچڕێت و دێتە سەر هێڵەکانی ریاڵ، لە هەمان کاتدا ئاماژەیە بە تەقینەوەی فشارەکانی ناوەوەی خود لەسەر دەرەوە، بەڕادەیەک سنوورەکانی جیهانی ناوەوە وا تێکەڵ بە جیهانی دەرەوە دەکات، کە ئەو ئافرەتە جوانەی کە داینەمۆی

خەونـــــەکانییەتی و جیهانی ناوەوەی کۆنترۆڵکردووە، لە دەرەوەدا لە ریاڵدا لێی دەبێتە پیرەژنێکی دیان، بەمەش چاوی جیاوازییەکان هەردوو جیهانی ناوەوە و دەرەوە زەق دەکاتەوە، لە بەرامبەر شارێکی دێرین و ماندووی وەک کەرکوک خاوەن چەندین نەتەوە و ئایین و زمانی جیاواز، تا ئاستێ پیرێژنەکە بە زمانێکی جیاواز لە زمانی کوردی، بەبێ پرسیار و بەدواچوون یەکسەر پێی دەڵێت: (لا کاکە لا)[١٤]، ئەمەش سەرسامییەک لای کەسایەتی (میران) دروست دەکات، بە سەرقاڵبوونی خۆی و خەمساردی ئەوی پیرێژن، لە پەی نەبردن بە داکەوتەکانی تاکی کورد لە کەرکوک، بۆیە قەیرانی ئەو هێز و فشارەی کە هێنایە دەرەوە، وەک کاردانەوەیەک بەهەمان تواناوە بە پێچەوانەوە دەیگەڕێنێتەوە بۆ جیهانی ناوەوە، لێرەوە چیرۆکنووس هەماهەنگییەک لەنێوان دەرەوە و ناوەوەدا دروست دەکات، لە ناوکۆی ئەم ئاوێتەبوونەدا کەسایەتی یەکسان دەبێت بە گووتاری دەق، کاتێ لە ریزبەندیی رووداوەکاندا دێتە ناوکەسایەتییەکانەوە، رەهەندەکانی تراژیدیا کۆدەکاتەوە، بۆ ئەم مەبەستەش بە فلاشباک بەدواچوون بەدوای وێنەکان دەکات و لە سەرەتاوە روو لە فاکتەرەکانی ناو دەروونی شاکەسەکەی دەکات، دەکرێت بەپێی دەروونناسی شرۆڤەی بۆ بکەین بەوەی منی باڵا (super ego) بە (میران) ناودێر بکەین، خەسڵەتی منی باڵا (super ego): چاودێریکردنی ئەوی (id)یە و لایەنی ئەخلاقی و ئامۆژگارییە، گەر بە نەرێش بێت، هەڵوێستوەرگرە و دەکرێت بڵێین دەنگی ئەو ئافرەتە بە پێوەرەکانی پرینسیپ لە زمانی منی (ego)وە، کە نێوەندێکە لەنێوان دنیای دەرەوە و لەنێوان ئەوی (id)وە کە بۆماوەیە، تەوەری بوونی کەسە و لەژێر دەسەڵاتی پرینسیپی لەزەت و حەزدایە و خەونیش یەکێکە لەو حەزانەی ئەوی (id)وە، بە ریاڵ دەنگی منی (ego)یە، کە پەنا دەباتە بەر ئەوەی (id)ی شاکەس و دەڵێت (فریام بکەوە و کچەکەم ون بووە)[١٥]، لەکاتێکدا ئەم خۆی ونبووە، بەدوای لێکدانەوەی خەونەکانیدا وێڵە، ئیتر چۆن دەتوانێت روماڵی ئایندە بکات کە لە کچە ونبووەکەیدا خۆی دەبینێتەوە، بانگکردن و ئاگادارکردنەوەی منی (ego)، کە لە ژنەکەدا بەرجەستەبووە بۆ خەون و خەیاڵەکانی کە لە ئەوی (id)دا جێگربووە، بۆ سەلماندن و پشتڕاستکردنەوەی بۆچوونەکەمان، رووداو لە ناوەوەی شاکەسی چیرۆکەکە کە بە میران ناسراوە، پۆپکەی گرتووە بە مەنەلۆج، بە خۆی دەڵێت (چواردەوری خۆم بە نیگا بێژاو کەسم نەدی)[١٦]، کەسایەتی سەرەکی کە (میران)ە: کەسێکە زیاتر پابەندی خەون و خەیاڵە، هیچ کردەوەیەکی پراکتیکی لێوە نابینرێت، بوونەوەرێکی نەرێی بەرەوڕووی ناوەخن داخراوە، لە خولگەی خود دەخولێتەوە، هاتنەدەرەوەی

دژواره، ئەمەش لە دەنگی ئافرەتەکەوە ئاشکرا دەبێت (وادیارە تۆ بە دەنگی کەسەوە ناچیت)[١٧]، بۆیە هەر لە ڕێگای خەیاڵەوە بە مۆنۆلۆج لە دوو سەرەوە بەسەرهاتەکان دەگێڕێتەوە، دەیەوێت لە تەک خۆیدا پارسەنگییەک بەدەستبهێنێت، لەسەرێکەوە بەدواچوونی ویستەکانی منی (ego)یە، کە لە ئافرەتەکەدا خۆی دەنوێنێت، لە سەرێکی دیکەوە بە ڕێچکەی ڕیاڵەوە پەیوەستی دەکات، لە دواییشدا بە ئاراستەی ناوەوەدا پێی دەگەیەنێت، لە دەنگی ئافرەتەکەوە بۆی تەواو دەکات و دەڵێت (گوێ لە کەس ناگری)[١٨]، ئەمەش بە مانای هەبوونی داوایەکە کە بە دواچوونی بۆ ناکات یان تێنەگەیشتنە لە چەمک و دنیای داواکە، پەی نەبردنە بە فاکتەری داواکان، بۆیە لێکدانەوەی بۆ ناکات و پشتگوێیی دەخات، کە ئەویش داواکانی ئەوی (id)یە، ئەم بە حوکمی ئەوەی پتر لە خەیاڵدا دەژی، یەکسەر بیری بۆ شتی خراپ دەچێت، هەستەکانی بە کردەی سێکسەوە گرێدەدات (دیارە حەزێکی مێیانە دەیبزوێنێت)[١٩]، وەلێ دیسانەوە دەنگی منی ((ego بەرز دەبێتەوە ناکرێت فەرامۆشی بکات بە منی باڵا (super ego)ی کەسایەتییەکە دەڵێت (واز لەو لێکدانەوە هەلەق و مەلەقانە بێنە، خۆ تۆ نەنووستوویت)[٢٠]، ئەمە جگە لە سەلماندنێکی دیکەی بۆچوونەکەمانە بەوەی لە کاتی نووستن و بێئاگاییدا، ویستەکانی ئەوی (id) زەق دەبێتەوە، کەسایەتییەکە دەکەوێتە ژێر ڕکێفی حەزە شاراوەکان، لە هەمان کاتدا تانە و گلییەکە، لە کەسی بەرامبەر لە منی باڵا (super ego)، کە تەنیا لە خەودا دەتوانێت ئەرکە زایندەکەی وەک پیاوێک بەجێبهێنێت، وەلێ وەک کردار هیچی پێ ناکرێت، گەر لە گۆشەیەکی دیکەوە سەیری بکەین، ئەمە بێ بڕوایی و گومان لە توانا سێکسییەکانی کەسایەتی بەرامبەر دەکات کە ناوی (میران)ە، کە بە دیوە شاراوەکەی دڵداری بووە لە دوای خەساندنی کەسایەتییەکە گەر بەشێوەیەکی کاتییش بێت، وەک هێمایەکی بەردەوامبوون و مانەوە، سێکس دەکاتە قسەی هەلەق و مەلەق، چونکە لە ئێستای ڕیاڵدا ئەمی ئافرەت خەون و داوایەکی گەورەتر دەخاتە گەردنی (میران)ی کۆنەدۆستی، ئەویش سەحکردنی ئەو ڕێگایەیە کە دەیگەیەنێتە ئاستی دۆزینەوەی بەهاکانی خود، تا ئەو حەلەی هانی دەدات و دڵنیای دەکات، بەوەی خەون نییە تا بیبینێت، بەڵکو (دەنگی من دەنگێکی ڕاستەقینەیە، دەی بە دووی دەنگەکەمدا وەرە)[٢١]، پەردەلابردن لەسەر نهێنییەکان و گەڕانەوەی متمانە بۆ ئەو حەزە خەوتووانە، کە بووەتە بەشێک لە هەژموون و پێکهاتەی کەسایەتی (میران)، وا دەکات لە ڕایەڵەکانی ڕووداو، کە لە دوو بەرەوە کار بۆ بونیادی دەق بکات، ئەم کاتێ بە قسەی منی (eg) کە لە ئافرەتەکەدا بەرجەستە بووە، بە ڕێگاکەدا دەڕوات و

لەگەڵ رۆیشتندا خەیاڵەکانی هێدی هێدی ئیش لەسەر شکاندنی تەگەرەکانی منی باڵا (super ego) دەکات، بەسەر تەنگژەکاندا سەردەکەوێت تا دەگاتە قەڵای دێرینی کەرکوک، قەڵای کەرکوک کۆدێکە و هاوشێوەبوونێک فەراهەم دەکات و رووداوەکان پێکەوە گرێدەدات، وێرانەی ناوەوەی کەسایەتییەکە یەکسان دەکات بە وێرانەی دەرەوە، بە کەرکوک، ئەمەش ئەو هاوسەنگییە بوو کە پێشتر ئاماژەمان بۆکرد، بە مانایەکی تر ناخی ئەم، رەنگدانەوەیەکە بۆ قەڵای کەرکوک، نیشتەمەنی بەسەرهاتەکانی کەرکوکە، چوونی کەسایەتی میران بۆ سەر قەڵای کەرکوک، زاڵبوونی ریاڵە و پێڵێنانە بۆ ئاشکراکردن و دۆزینەوەی خود و بەهای میرانە وەک مرۆڤ کە پێشتر گووتمان لە دوو سەرەوە ئیشی بۆ دەکات، لەسەرێکەوە پەردە لەسەر ئەرشیفی هۆیە دەرەکییەکان ناخی ئاشکرا دەکات کە بووەتە ئەرشیفی مێژوویی لە نیشتەمەنی چەوساندنەوە و ستەمکاریی و چەپبوون و خۆخواردنەوە لە پێکهاتەی کەسایەتی دەڤەری کەرکوک. کە بەس لە خەیاڵدا ئیش دەکەن، لە ریاڵدا لە ئاست رەوتی رووداوەکاندا نین، هەر لە سۆنگەی ئەم ستەمەدایە کۆنەدۆستەکەی (مینا کافرۆشی)، بە بنیادەمێکی بچووک دەچوێنێت (بوونەوەرەکە لە بنیادەمێک دەچوو کە لە قاڵب درابێت و بچووککرابێتەوە)[٢٢]، گێرانەوەی دۆستە کۆنەکەی بۆ قەبارەی سروشتی خۆی، لە گەڕانەوەی کەرکوکەوە سەرچاوەی گرتووە، کە بگەڕێتەوە بۆ پێگەی سروشتی خۆی، بۆ نیشتمانی باپیرانی، بۆ کوردستان، هەر رایەڵەکانی ئەم داکەوتەیە پەلی هاویشتووە بۆ چینە قووڵەکانی نەستی کە لە ئەوی (id) جێگیربووە، وا دەکات کە (میران)ی تووشی حاڵەتێکی نامۆبوون بکات، بەوەی ئەم دەیەوێت یادی ئەو پەیوەندییە دێرینە زیندووبکاتەوە کە لەگەڵ دراوسێ کۆنەکەیدا هەیبووە (ئەو رۆژگارەی کە مینا دراوسێمان بوو)[٢٣]، ئەوکاتە مینا کافرۆشی ئەفسانەی ئەوین و عەشق و جوانی بوو، بەڵام مینا بۆ مەبەستێکی جیاواز گەڕاوەتەوە، خەمی مینا هەژاریی و کارەسەتەکانی شاری کەرکوکە، لەبارچوونی خەونەکانییەتی، سەرقاڵی بوونی کەسەکانییەتی بە ژمارەوە، مەبەست لە بەکاربردنی ژمارە، نەبوونی سەرەتا و کۆتایی کارەساتەکانی شاری کەرکوکە (١٩٦٣ی هێرشەکانی حەرەس قەومی بوو، ١٩٧٥... پەیمانی جەزائیر لە دژی بزاڤی رزگاریخوازی کورد مۆرکرا، ١٩٩١ کۆڕەوی سێ ملیۆنی کوردان، ١٩٨٨ پرۆسەکانی ئەنفالی بەدناو، بڕیاری ١٤٠ بۆ گەڕانەوەی ئاوارە کوردەکان و دەرکردنی عەرەبە هاوردەکانی شاری کەرکوک)، ئەمە جگە لەوەی (مینا کافرۆشی) داوا لە (میران) دەکات رووفاتی (سارا)ی کچی بۆ بدۆزێتەوە، کە دیار

نییە، گەر لە روانگەیەکی گشتگیرییەوە لە کەسایەتی (میران)ەوە سەیری خەڵکی کەرکوک بکرێت، ئەوا دەکرێت لە هەمان روانگەوە (میران) وەک کەرکوک سەیری (مینا کافرۆشی) بکات، پەیوەندی (میران) بە (مینا کافرۆشی)یەوە پەیوەندییەکی دێرین و مێژووییە لە یەک ناترازێن، هەروەک پەیوەندی منی باڵایە (super ego) بە ئەوی (id)ی ناوەوەی میرانە، سەر قەڵا سنگی مەحەکە و دادگایە و دانیال پێغەمبەر دادوەر و سەرپشکی سەرجەم رووداوەکانی شاری کەرکوکە، ئەرشیفی بەسەرهاتەکانە، بێگومان ئەرشیف مێژوو و شوێن و شوێنکاتی هەیە، هێز و پاڵنەری جوڵاندنەوەی (میران) بۆ کەشفکردنی پێگەی خۆی لەنێو هاوکێشەکەدا بە دیوی ناوەوەدا (مینا کافرۆشی)یە و بە دیوی دەرەوەدا شاری کەرکوکە، شوێن لە ناوەوەدا لای (میران) دڵە، لە دەرەوەدا ئەو چاڵەیە کە لەناو جەستەی کەرکوکدایە (لەناو جەستەی مینا کافرۆش)دایە، کە بووەتە هۆی بچووکبوونەوەی (ئەو چاڵەی لێکەوتەوە منیشی ئاوها بچووک کردەوە)[٢٤]، رەنگرِشتنی رووداو لە جەستەی شوێندا دەبێت چ نهێنییەک لە دەروازەکانی مێژوودا والا بکات، چی لە ناوەوە و دەرەوەدا، لە خەیاڵ و ریاڵدا ئاشکرا بکات، چۆن پەیوەندی کەسایەتی بە شوێن و بە رووداو و بە کەسایەتی دیکە و بە دەروونەوە دیاری دەکات. (مینا کافرۆشی) هەروا بەخۆڕا باسی ئەو چاڵانەی بۆ ناکات کە (لە ئەنجامی ئاگرکەوتنەوەیەک ئەو گرمە و ئاگرەی لێکەوتەوە)[٢٥]، دیارە مەبەستی لە دۆزینەوەی نەوتە، ئایا بەمە پاساو بۆ بێگوناهی خۆی ناهێنێت، لە لێکەوتنەوەی ئاکامە جەرگبڕەکانی، کە دەکرێت لە ریزبەندی رووداوەکانەوە لێکدانەوەی تایبەتی بۆ بکەین، بەوەی دۆزینەوەی نەوت لە جەستەی ریاڵدا، نەک بزرکردنی پێگەی خۆیەتی لە دەروونی کەسایەتی میراندا، بەڵکو مەعلانکردنی مردنییەتی لە ریاڵدا، چونکە هەوێنی سامانە سروشتییەکان، نەوت بەتایبەتی نەک لە رابردوودا، ئێستاشی لەگەڵدابێت بوونەتە فاکتەری راگواستن و نەهامەتی و مردنی بەردەوامی خەڵکی بێگوناهی دەڤەرەکە، بە بەڵگەی ئەوەی هەر لە زمانی (مینا کافرۆشی)ەوە کە بە سارای کچی دەڵێت (ئێستا تۆش مناسا لە جەستەی کۆترێکی سپی جێگیربوویت)[٢٦]، یان بە دیوێکی دیکەدا، ناسینی نەوت و بڵێسەی ئاگرەکەی باوەگوڕگوڕ، نەبووەتە نامۆبوونی کەسایەتی (میران)، ئایا ئەفراندنی کەسایەتییەکی ناجێگیر فەراهەم ناکات! کە لەسەر بڕیارێک ئۆقرە ناگرێت، لە سەرێکەوە بڕوا ناکات ئەوە (مینا کافرۆشی) دەنکی بێت، لە سەرێکی دیکەوە بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ پێ لەوە دەنێت کە خۆیەتی، بەڵام تووشی ڤایرۆسێک یان نەخۆشییەک هاتووە، بۆیە لەترسا تووڕیەدات (بە توندی دەستم راوەشاند،

بێئەوەی گوێم لە ترپەی کەوتنی بێ)[٢٧]، لە هەنووکەدا فرێدەدات و ئاگری ئەو عەشقە دێرینە خامۆش دەکات کە بەدوایدا وێڵ و سەرگەردان بووە، لە هەمان کاتدا نایەوێت لەبیری بکات، ئەمەش جۆرێکە لە نامۆبوون لە دووفاقی (نەمدەویست دیمەنی رابردووی مینا کافرۆشی شاجوان لە زەینی خۆم بسڕمەوە)[٢٨]، بێگومان ئەو ناتوانێت شتێکی جێگیری ئەوینئاسا لە شوێن و قەوارەیەکی ناجێگیردا بسڕێتەوە، بۆیە بە بەهانەی بەزییەوە دیسانەوە مینا کافرۆشی هەڵدەگرێتەوە. ئایا بە هاتنی فاکتەرەکانی پارەو داهات لە دەرگای نەوتەوە، دەرکردنی ئەوین نییە، کردنەوەی پەنجەرەکانی گومان نییە لە ئاست هەڵوێستوەرگرتن لە بەرامبەر کەسێتی (میناکافرۆشی) و خەڵکی شارەکە، ئایا هەستکردن بەو گومانە لە قۆناغێکی دیاریکراودا لە دەرئەنجامی بگرەوبەردەی ناوەوە و دەرەوەدا لە ئایندەدا نابێتە چەمکێکی بەدگۆڕان، بچووکبوونەوەی تاکەکانی شار بە (مینا کافرۆشی)شەوە، هەرچەند لە ئێستادا دەیکاتە گریمانەیەک و پێشبینی ئەوەش دەکات کە خەڵکی شار هەموو بچووکبێتەوە، بەڵام کەسایەتی (میران) لە پێشتر ترسی بەدگۆڕان و گومانی لە بچووککردنەوەی (مینا کافرۆشی) دا هەبووە (کەوتمە دۆخێکی ترس و گومانەوە، چونکە هێشتا بڕوام نەدەکرد چ بوونەوەرێکی بچکۆلەی ئاوها مینا کافرۆشی بێ)(٢٩)، دوورکەوتنەوەی میران لەگەڵ مینا کافرۆشی، ڕێخۆشکردنە بۆ رامکردنی رایەڵەکانی گووتاری چیرۆکەکە، (میران)ێ هەروەک کەسێکی ئاسایی بەرلەوەی ناوی خۆی فێربێت، بووەتە ناسنامە و شووناسی کۆمەڵێ ژمارە و بەسەرهاتی شووم، بووەتە وێرانە، لەدوای مردنی (مینا کافرۆشی) و بێ ئومێدبوونی لە دۆزینەوەی گۆڕەکەی (ساراو)ە، ناچار روو لە وێرانەیەکی تر دەکات، دەیکاتە ئاشنا، هەتا لە رێگای گێڕانەوە و برێک لە فشاری ژاندارییەکانی دەروونی سووک بکات، لە سەرەتاوە بە مۆنۆلۆج برێک لە رووداوە مێژووییەکان لە سایەی (مینا کافرۆشی)ەوە دەگێڕێتەوە، لە ئێستادا دەبێت ئەڵتەرناتیڤێک هەبێت بۆ (مینا کافرۆشی) هەتا رووداوەکانی بۆ باس بکات و خۆی پێوە گرێبدات. گرێدانی مرۆڤ بە کارەساتەوە خۆی لە خۆیدا کارەساتە، نە دەتوانێت لێی دەرچێت نە لە توانایدایە چارەسەری بکات، چونکە بەستراوە بە هێزی سەربازیی و فشاری دەرەکییەوە، ئەمە کێشەی راستەقینەی خەڵکی کەرکوکە، بەتایبەتی و هی کوردستانە بەگشتی. کارەساتی کەسایەتی میران لەوەدایە، لە خەودا ئیش دەکات و بەدوای لێکدانەوەی خەونەکانیدا دەگەڕێت، لە ئێستای ریاڵدا ناژێت و پەنا بۆ مێژوو دەبات، لە ئێستادا نامۆ و بێدەسەڵاتە، (وام بە خەیاڵدا هات لە شوێنکاتی ئێستا نەماوم و چەندین

سەدە پێش ئێستا دەژیم)[٣٠]، بەم پێیە دەیەوێت لە دەرچەی مێژووەوە باز بەسەر ئێستادا بدات و ئایندەی خەونەکانی دەستبکەوێت، بۆیە کاتێک لە وێرانەکەی قەلاّ، وەک ئەڵتەرناتیڤی (مینا کافرۆشی دۆستی)، پەنا بۆ (دانیال پێغەمبەر) دەبات، هەتا لە رێگای ئەوەوە، هەندێ رووداوی مێژوویی دیکەمان بۆ باس بکات، وەلێ لێرەدا پرسیارێک سەر هەڵدەدات، دانیال پێغەمبەر وەک دادوەرێ هەڵگری سەرجەم پێشینەکان و رووداوەکانی شاری کەرکوکی ئەرشیف کردبێت، ئیتر چ پێویست دەکات (میران) جارێکی تر رووداوەکانی بۆ باس بکاتەوە، ئایا لە سۆنگەی ئەوەیە کە بەقای پێ بکات، هەتا بتوانێت داوای خەونامەکەی لێ بکات، دیارە ئەویش متمانەی پێ ناکات و نایداتێ (جەستەی تۆ بۆنی ئەو تەلارانەی لێ دێ سەغڵەتم دەکات)[٣١]. ئەمەش کارەساتێکی تر دەخاتە سەر کەسایەتی (میران) و رایدەتەکێنێت، ئەمێکی شارستانی کە بۆنی تەلاری لێدێت چۆن دەکرێت بە لێکدانەوەی خەون کێشەکانی سەردەم چارەسەر بکات، یان بە گێرانەوەی مێژوو نەخشەی ئێستا و ئایندە بکێشێت و بەراشکاوی بە رووتەق دانیال پێیدەڵێت (واز لە خەوننامەکەی من بێنە، چونکە بۆ لێکدانەوەی خەونەکانی سەردەمی تۆ نابێ)[٣٢]، لە هەمان کاتدا ئایا (میران) بۆ هێنانەدی مەرامەکەی پەنا بۆ (حونەین، یان عوزێر) پێغەمبەر نابات؟، کە لە هەمان شوێندان بە تەنیشت (دانیال) پێغەمبەرەوەن و هەتا ئێرە کەسایەتی (میران) لە تەنگژە و شکستی دوو خەوندا دەژیا، لە قۆناغی یەکەمدا، خەونی رۆژانی رابردوو، خەونی رۆژانی رۆمانسییەت و بەدی نەهێنانی داواکانی ئەوی (id)، کە لە حەزەکانی (میراندا) بەرجەستە بووە، لە قۆناغی دووەمدا لە سۆنگەی بەدی نەهێنانی پەیامی خەونەکەی لە ریاڵدا پەنا دەباتە بەر خەونێکی تر و دەیکاتە ئەڵتەرناتیڤی خەونی یەکەم، هەتا لە رێگایەکی دیکەوە شوێن و پێگەی کەسایەتی خۆی بگێڕێتەوە لە لای کەسایەتی (مینا کافرۆش)ی کۆنەدۆستی، چونکە ئەم درک بە شکستی خەونی یەکەم دەکات کە نەیتوانی داواکانی (مینا کافرۆشی) بەدەست بهێنێت، شکستی خەونی دووەم لە پەنابردنییەتی بۆ دانیال پێغەمبەر، بۆ مێژوو، کە هیچ چارەسەرێکی هەنووکەیی پێ نییە، بەم پێیەش لە ئاسۆی (میران)دا ئەوە روون و ئاشکرا دەبێت کە هەرگیز مێژوو نابێتە ئەڵتەرناتیڤی ئێستا و ئایندە، هەروەک داواکانی دڵ لە خەوندا نابنە ئەڵتەرناتیڤی پەرچەڤەکردنی ئەوین لە ریاڵدا، بۆیە لە دوای گەڕانەوە و پێداچوونەوە بۆی، دەردەکەوێت کە یاخیبوون لە داواکانی (مینا کافرۆشی) کەرتبوونی خودە لە داکەوت، دڵە لە دولبەر، هەستە لە خۆشی، رازیبوونی کەسایەتییە بە گریان و تووڕەبوون، رازیبوون بە بچوکبوونەوەی (مینا

کافرۆشی) لە کانگادا، بێدەنگییە لە ئاست کەمبوون و بچووکبوونەوەی خودە لە یاخیبوونی ریاڵ، لە خەون و خەیاڵ، رووکردنە لە ریاڵ، بۆیە بەدووری نازانین کە (مینا کافرۆشی) جارێکی تر رۆڵ لە کەسایەتی (میران)دا بگێڕێت، ئەویش کاتێک هەڵدەگرێتەوە دەیگەیەنێتە راستییەک کە نەفرەتی ئەو کارەساتانە هەر لە یەکەم تەقینەوەی گڕی بیرە نەوتەکانەوە، کە ئەمی سووتاند و بە سیحری سیاسەتمەداران بە بەدگۆڕان ئەمی بچووککردەوە، ئێستاش لەگەڵ ئاگر و تەقینەوەی هەر کردەوەیەکی تیرۆریستیدا، کەسانێکی زۆر نەک بە بەدگۆڕان بچووک دەبنەوە، بەڵکو دەبنە سەگ و پشیلە و کۆتر (خستمە نێو لەپم و چاوم تێ بڕی و وتی میران لەگەڵ هەر گرمەیەکی شاردا چەندین کەس بچووک دەبنەوە دەبنە کۆتر و پشیلە و سەگ)[٣٣]، بۆ دواجار مینا بە میران دەڵێت، واز لە رابردوو بێنە و بەیەکجاریی بەجێت دەهێڵم، ئەمەش هەڕەشەیە و ئاماژەیە بە شکستی سێیەم، چونکە شوێنکات لە رابردووەوە درێژەی هەیە بۆ هەنووکە، لە ئێستاوە پێدا بچۆرەوە شار دۆکیۆمێنتە، ئەرشیفە، یەک بە یەک پەڕەکانی هەڵبدەرەوە بزانە کێ شاکەسی کارەساتەکانە، ئەمەش بە دوو جەمسەر پۆلێن دەکرێت، جەمسەری یەکەم وەک تاک کە خودی (میران) و شکستییەکانی دەگرێتەوە لە چۆنییەتی مامەڵەکردنیدا لەگەڵ ئەویندا، لە ئاستی دووەمدا وەک کۆ، چینی دەسەڵاتدار دەگرێتەوە لە شێواندنی ئەتمۆسفێری پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و گاڵتەکردن بە بەها و خەون و چارەنووسی خەڵکی، کە ئەویش لە دۆگماکانی نەزانین و ستەمەوە سەرچاوەی گرتووە، بە بەڵگەی ئەوەی دەڵێت: (هەر قەوماوێک پیاوێکی گێل بەرپای کردبوو)[٣٤]، چۆن کارەسات ناجێگیریی شوێن فەراهەم دەکات، ناجێگیریی دەروون ناجێگیریی شوێنی لێدەبێتەوە، دەبینین گەشتەکەی لە رووی مێژووییەوە لە کۆنترین شوێنی کەرکوکەوە دەست پێدەکات، کە لە ئێستادا گەڕەکی عەرەفەیە، دوایی دێتە رەحیماوا، ئینجا سینەما خەیام کە ناوی ماوە، بەڵام خۆی وەک سینەما نەماوە، لە کۆتاییشدا دەچێتە قەڵای دێرین، لەبەرئەوەی کەسایەتییەکە جێگیر نییە، بۆیە هەمیشە لە گواستنەوەدایە و شوێنەکان دەگۆڕێت و لە شوێنێکدا ئۆقرە ناگرێت گەر بەهۆی فشاری دەرەکییەوە بێت، یان بەهۆی کاردانەوەی ناوەکییەوە بێت، هەمیشە پەرتەوازە، گەر تەماشای کەسایەتی (میران) بکەین وەک تاکێکی کوردی شاری کەرکوک، کە لە جێهێشتنی گەڕەکەکانەوە دەستی پێکرد و پەرتەوازە بوو، لە کۆتاییدا لە ئاستێکی گەورەتردا دەبینین کە چۆن خەڵکی کەرکوک نەک لە جێهێشتنی گەڕەکەکان، بەڵکو پەرتەوازە و ئاوارە و نیشتەجێی شارەکانی تری

بەدەم هۆنینەوەی خەناوکەی بیرەوەرییەکانی منداڵی و
لەگەڵ گێڕانەوەی داستانەکانی نەهامەتی ساتەکانی لێکدابڕان
عەسرە چایەک دەخۆینەوە

بە زەمکردنی ئەو دۆستانەی کە نازانین نە زەمەن هەستە جوانەکانی
هاوڕێیەتی لە سەندنەوە، نە خۆیان بێوەفایانە ئێمەیان لەبیرکرد، چەند
پیاڵەیەک گوڵەبەڕۆژە دەقرتێنین و
ناوە ناوەش پەرداخێک ئاوی تەزیو دەکەینە سەرزەوی سووتاوی رۆحی
ماندوومان

دڵنیامە دیسان
خەمی کۆستێک چاوەکانم تەڕ دەکەن و
تۆش بە وەبیرهێنانەوەی بەسەرهاتێکی هەزەلی خۆمان و
بە گێڕانەوەی تازەترین نوکتەکانی شار
لەگەڵ خۆت، قاقا پێمدەکەنینی



# تۆ



● سارا زینەتی

تۆ!
کوڕێ بووی لەناو مژەوە هاتی
کوڕێک لە جنسی دەریا
بە شمشێرێک لە شمشێرە ئاگرینەکانی جەهەننەم
هاتی ئەم تەمە ساردەی ئاڵابوو لە گیانم بیتوێنیەوە
لە رووناکی ئەشقێکی قووڵ
دوو باڵت پێ بەخشیم
-دوو باڵ لە جنسی باڵە شینەکانی خۆت-
من!
کچێک دیلکراو لە تەنیاییەکی قووڵ
کچێک کە تەنانەت پرچەکانی خۆشی لە رۆحی ئاڵاوە
کچێک پاشماوەی ئەو پیرەژنانەی جوانییان بە سمێڵ دەفرۆشت
ئاسمانیان لەنێو ئاودا ئەنجن ئەنجن دەکرد

***

**تۆ کوڕ نەبووی!**
**منداڵی ئادەمیزادەکان نەبووی!**
**فریشتەیەک بووی لە باوەشی ئەستێرەکانەوە فڕێدرایتە خوارەوە**
**تۆ پێغەمبەری نوور و گوڵ و ئەستێرە بووی**
**هاتی و ڕۆحی بێزارمت گەورە کرد**
**هاتی و منت بە خۆم ناساند**
**بیرم هاتەوە زەمانێ لەنێو دەریادا ژیاوم**
**بە منداڵی لەگەڵ شەپۆل کایەم کردووە**
**بیرم هاتەوە منیش کچ نیم!**
**لە جنسی تۆم!**
**فریشتەم! فریشتەیێ لە فریشتە پاکەکانی دەریا...**



# چاوەکەم چاوی رەشی تۆ
# ئافەتی گیانی منە



**(بە گیانی پاکی دادە ئەحلام پێشکەشە)**

● **هەنار ئەلسەراج**

زۆر بەئەسپایی لە زانکۆی سلێمانییەوە بەرەو خوار دەڕۆشتین، رۆژێکی باراناویی و سارد بوو، دادە ئەحلام لەسەرخۆ و لەبەرخۆیەوە گۆرانی (چاوەکەم چاوی رەشی تۆ ئافەتی گیانی منە)ی دەوتەوە، منیش وتم: دادە ئەوە بۆ ئەوەندە سەرسامی ئەم گۆرانییەی وا زوو زوو دەیڵێیتەوە؟

وتی: بۆ نازانی؟

وتم: نا.

وتی: دە باشتر وایە نەیزانی.

ئیتر ئەو رۆژە زۆرم بیر لێ کردەوە، بۆچی من نەیزانم؟ بۆ ئەوەندە حەز لەو گۆرانییە دەکات؟ بۆچی سووکنایی دێت کە دەیڵێتەوە؟ زۆر پرسیاری تریش، زۆر هێنام و بردم، وتم خۆ ئەمە گۆرانییەکی تایبەتە وەکو شیعر وەک موزیک و... هتد.

ماوەیەک بەسەر ئەو ڕۆژە سارد و خۆشەدا ڕۆیشت من و دادە ئەحلام، زستانی ٢٠٠٦ لەماڵەکەی خۆیدا بە دیار گڕی سۆپا و کڵپەی چرا نەوتییەکانەوە بووین، دادە جگەرەی لەدوای جگەرە دادەگیرساند و من وتم دادە دەزانی چیمان کەمە؟

وتی: قاوە بەغابیەکەی تۆ.

ئیتر قاوەیەکی خۆشمان خوارد، هیوام وابوو لەماوەی قاوە خواردنەکەدا جگەرە کەم بکاتەوە، وتم دادە ئەوە جگەرەت لە دوای جگەرە داگیرساند بەسە دادە گیان ئەوە عەزێتت دەدات.

وتی: من بوومەتە سوتووی کۆمەڵگە، ئیتر تۆ خەمی چیتە؟

وتم: دادە تۆ کڵپە و ئاگری کۆمەڵگاکەمان بوویت، تۆ لە یەکەمین ژنەکانی پاڵپشتی ژنان بوویت، بە نووسینەکانت، بە دەرکەوتنت، بە تەحەداکردنی کومەڵگا...

وتی: دە تۆش واز لە قسە خۆشەکانت بێنە، زەمەنی قسە خۆشەکان کۆتایی هات.

وتم: با بەدڵی تۆ بێت.

زۆر بەخێرایی بابەتەکەی گۆڕی و وتی: دەزانی من نائاسایی برسیمە؟ دوو ڕۆژە نانم نەخواردووە تەنها قاوە و ئاو.

وتم: بۆ دادە؟

وتی: من ئێستا تووشی شتێک بووم بە عەرەبی پێی دەڵێن: (النزيف الادبي).

منیش زۆرم پێ خۆش بوو، زۆرجار ڕۆماننووس و ئەدیبەکان تووشی ئەو حاڵەتە دەبن و ئەوەندە خولیای نووسین و گێڕانەوەی ناخی خۆیان دەبن، نیو ئەوەندە بیر لە خواردن ناکەنەوە.

وتم: دەباشە ئێستا چی بکەین؟

وتی: ئەو دەفتەر و قەڵەمەم بۆ بێنە بابنووسین.

وتم: چی بنووسین، چیرۆک یان ڕۆمان؟

وتی: ژیاننامەی ئەحلام مەنسور.

زۆر سەرسام بووم، نەختێک وەستام، دواتر وتم: دادە بۆ تۆ هەست بەچی دەکەیت؟

وتی: من هەست دەکەم چەند ساڵێکی کەمم ماوە بۆ ژیان، تۆ یارمەتیم دەدەیت بۆ نووسینەوەی ژیاننامەی خۆم؟

ئیتر هەر ئەو شەوە دەستمان کرد بە نووسینەوەی ژیاننامە و بیرەوەرییەکان، لە ماوەی ٣ مانگدا ٢٠٠ لاپەڕەمان نووسی، ئەو بە زمانە ئەدەبییە شیرینەکەی بیرەوەرییەکانی دەگێڕایەوە و منیش زۆر بە سەرسامییەوە دەمنووسین، زوو زوویش بە بیری دەهێنامەوە: وەکوی ئەوەی من دەیڵێم بینووسە، هیچ نەگۆڕیت. ڕاستە چاوم کز بووە، بەڵام بیگۆڕیت هەستی پێدەکەم. ئیتر منیش بەدەم پێکەنینەوە بۆ قسەکانی و بەدەم سەرسامبوونیشەوە بۆ بیرەوەرییەکانی خێراتر دەمنووسی. دەمویست بزانم چیتر ماوە لە بیرەوەرییەکان، چێژێکی زۆر سەیرم لە نووسینەوەی بیرەوەرییەکان وەردەگرت، وتم: دادە بۆ ئەوەندە بە دوورودرێژی باسی ڕووداوەکان دەکەیت؟

وتی: من هیچ جێناهێڵم بۆ خوێنەر، ڕاستییەکان لای منن.

پاش ماوەیەکی تر کۆبووینەوە، وتم دادە زۆر دەمێکە وەعدت پێداوم سەیری وێنەکانت بکەم، چەند وێنەیەکی بۆ هێنام، کە سەیری یەکەم وێنەم کرد هیچم نەوت، ئەها هەندێجار دەتەوێ شتێک بڵێیت و ناوترێت. سەیری دووەمم کرد ئەو شتەی کە ناوترێ بوو بە گریان، زۆریش هەوڵمدا هەستم پێ نەکات، بەڵام نەمتوانی ئەوەندە خۆم بگرم، گریانەکەم لەو تەرزە گریانە تایبەتییە بوو کە ڕەنگە مرۆڤ ٢٠ ساڵ جارێک بەو شێوەیە بگری.

وتی: کچەکەم بۆ دەگریت؟

بەدەم گریانێکی قووڵەوە وتم: دادە تەحەمولی ئەو هەموو جوانی و شۆخ و شەنگی و ناسکییەی تۆ ناکەم، تەحەمول ناکەم تۆ ببینم لەم وێنانەدا لەگەڵ ناسراوترین ئەدیب و نووسەر و هونەرمەندانی وڵاتدا و ئێستاش ژیانت وەک مشتێ خۆڵ بێت لە دەستی کەسدا نییە، ناتوانم ئاوا بە بێدەنگیی بتبینم.

وتی: من بێدەنگ نەبووم و نابم، جەنگاوەرەکان بە تفەنگ شەڕ دەکەن، من بە قەڵەمەکەم شەڕ دەکەم.

وتی: واز لە گریان بێنە، با ژیاننامەکەم بنووسینەوە.

دەستمان پێکردەوە و لە یەکێک لە بیرەوەرییەکاندا گەیشتە سەر باسی هێمن موکریانی، دادە وتی: ڕاوەستە هیچ مەنووسە.

دیسانەوە گۆرانی (چاوەکەم چاوی ڕەشی تۆ ئافەتی گیانی منە)ی وتەوە و دەستی کرد بە گریان، فرمێسکەکانی نەدەکەوتنە سەر ڕوومەتی، بەڵکو ئەوەندە بە خوڕ بوون من نەمدەتوانی بیانبینم، زۆر خێرا یەک لە دوای یەک دەکەوتنە کۆشییەوە.

وتم: دادە چیتە، تۆ بە منت وت مەگری؟ کەچی ئێستا خۆت دەگریت.

بەدەم هەنیسکەوە وتی: ئەم شیعرە هێمن موکریانی بەرەحمەت بێت، بۆ منی نووسیوە، کە بیری هێمن دەکەم، ناتوانم نەگریم.

ئیتر منیش نەمتوانی هیچ بڵێم، هەردووکمان گریاین و کەسمان هیچمان نەوت.



# دوو دەقی شانۆیی

دەقی یەکەم: خانمێکی شەبقە لەسەر.
دەقی دووەم: تارمایی یان سەرزەمینی بەختەوەری.

● عەبدوڵڵا سلێمان (مەشخەڵ)

## دەقی یەکەم:
## خانمێکی شەبقە لەسەر

**کاراکتەرەکان:**

سۆزان تەمەن لەدەوروبەری حەفتا ساڵ دەبێ... خاوەن پێداویستی تایبەتە و لەسەر عەرەبانەیە (کورسی پێچکەدارە).

دەنگی کارمەند هەر لە دوورەوە دەبیسترێت.

**شوێن:** گەزیبۆ (سابات- کەپر)ی بەردەم یەکێک لە باڵەخانەکانی سەرپەرشتیاری بەساڵاچووانە.

**کات:** لەدەوروبەری کاتژمێری دەی سەرلەبەیانی یەکێک لە ساڵەکانی هەزارەی سێیەمە.

**دیمەن:** سۆزان کەسێکی بەساڵاچووی خاوەن پێداویستییە تایبەتەکانە و لەسەر کورسی پێچکەدارە، شەبقەیەکی نەخشداری گەورەی لەسەرە. چێوەی

شەبقەکە وێنەی مانگ و ئەستێرەی بچووک بچووکی لەسەر نەخشکراوە، جگەرەیەکی بەدەستەوەیە و بەهێمنی لەو بارانە دەڕوانێت کە پێدەچێت خەریکی پێداچوونەوەی شریتی سەردەمانی زوو و گەنجی بێت، یان لەوانەیە بیر لە شتێکی تایبەت بکاتەوە. ڕووناکی دەچێتە سەر سۆزان و کورسییە پێچکەدارەکەی.

**سۆزان:** (بەدەم مژلێدان لە جگەرەکەی) سەیرە ئەوا چارەکێک دەبێ چاوەڕوانی ئەو دەم بەهاوارەم و کەچی دیار نییە. باوەڕناکەم لێم تێکچووبێت، خۆی گووتی سەعات دەی سەرلەبەیانی دێم بۆ گەزیبۆکە و پێکەوە جگەرەی ڕۆژ دەکێشین... (ئاوڕێک لەسەر شانی چەپی دەداتەوە) دیار نییە، تۆ بڵێی شتێک ڕووی نەدابێت؟ نا باوەڕ ناکەم، چونکە گەر شتێک بوایە من دەمزانی... خۆ ناشێت هێشتا نووستبێت؟ بڵێم چی دیسانەوە منی لەم سەرمایە سپاردۆتە تەنیایی... تەنیایی! تەنیایی چی؟ من هەموو ڕۆژ و مانگ و ساڵەکانم تەنیام... لەو ڕۆژەوەی ڕەمزی هاوسەرم مردووە من تەنیام... من خەڵکانێکی زۆر لە ژیانمدا بوونە و هەن، ئەوەتا لە قەرەباڵغترین باڵەخانەی سەرپەرشتیاری بەساڵاچوانم و کەچی هەر تەنیام... تەنیایی بەوە نییە دەوروبەرت چەند قەرەباڵغە و لەکوێیت، بەڵکو بەوەیە ڕوحت چەند تەنیایە... (ئاوڕێکی تر لەسەر شانی چەپی دەداتەوە) ئەو دەم چیکەنەیە پەندی پێدام... ئەوە من بوومایە و ئاوا دوابکەوتمایە پڕ چنگێکی لێدەکردم و جەنگی مەغلوبەی ساز دەدا. بەهەرحاڵ من زۆرجار بیر لە تەنیایی خۆم دەکەمەوە، ئەڵێن خوا تاک و تەنیایە، ئەی شەیتان و ئەو هەموو فریشتانەی دەوروبەی چین؟ دە کەواتە تەنیا نییە... باوەڕ ناکەم هیچ کەسێک هێندەی من تەنیا بێت... من هاوینان کۆترەکانی ئێرە و قەلەڕەشەکان هاوڕێیەتیم دەکەن و زستانانیش باران. بیرمە ئەو کاتەی لە هەڕەتی لاویدا بووم و لە یەکێک لە دوکانەکانی کێک دروستکردن کارم دەکرد و ڕەمزیم لەوێدا بینی و ناسی و دواتریش بووینە دڵخوازی یەکتر... ئای چەندم گاڵتە بەتەنیایی دەکرد، چونکە تامی تەنیاییم نەچەشتبوو، ئاسۆکانی پیربوونم لێوە دوور بوون و دیار نەبوون... گەلێ ئێواران لە کەناری ئەو دەریایەی پشتمانەوە لەگەڵ ڕەمزی لەژێر تریفەی مانگەشەودا باسی خۆشەویستیمان کردووە، باسی ئەوەمان دەکرد کە هاوسەرگیری دەکەین و منداڵ دەخەینەوە و ئیتر لەنێو زاق و زیقی منداڵەکان تامی سێوی موحیبەت دەکەین... (ئاوڕێکی تر دەداتەوە و قونگە جگەرەکەی دەستی دەخاتە نێو ئەو تەپڵەکەی کە لەوێدا بۆ ئەو مەبەستە دانراوە)، من بەگومانم لە نەهاتنی ئەو دەم هارە ئەترسم شتێک ڕوویدابێت. ئەترسم دوێنێ شەو حەبەکانی نەخواردبێت و ئەم سبەینێیە پێش لەخەو هەستانی من برابێتە

نەخۆشخانەی ئیمێرجینسی (فریاکەوتن)... نا باوەڕ ناکەم... (تۆزێک بێدەنگ ئەبێت وەک ئەوەی بیر لە شتێک بکاتەوە)، نا کارمەندەکانی ئێرە هەموو شتێک لەبیر بکەن ئەو حەبانەی ئەو دەم چیکەنەیە لەبیر ناکەن... دێتە بیرم دوو ساڵ بەر لە ئێستا کارمەندێک لەیادی دەچێت حەبەکانی بداتێ و چ کارەساتێک قەوما... دوای ئەوەی بردیانە نەخۆشخانە بۆ ماوەی هەفتەیەک، کارمەندە خەمساردەکەشیان لە کارەکەی لابرد و ناردیانە ماڵەوە. (بێدەنگییەکی کورت و بەخۆگورجکردنەوە) دەزانم دێت... نەختێکی تر پەیدا دەبێت... لەوانەیە ئەو مردوو مراوە چووبێتە سەرئاو... خۆ چوونە سەرئاوەکەیشی وەکو خەڵکی تر نییە و بە سەعات دەخایەنێت... لیشی بپرسیت دەڵێت سکچوونمە... ئەو پرچبڕاوە هەفتەی دوو سێ جار تووشی سکچوویی دێت... (پاکەت و چەرخەکەی دەردێنێ و جگەرەیەکی تر دائەگیرسێنێ)، ئەرێ ئەم دووکەڵە تاڵەم بۆ ئەوەندە پێخۆشە... خەڵکی لە گەنجیدا دەست بە جگەرەکێشان دەکەن و لەپیریدا وازی لێ دێنن... من بەپێچەوانەوە لە گەنجیدا جگەرەم بە رەمزیش تەرکدا و کەچی دوای مردنی رەمزی من دەستم کرد بە جگەرەکێشان... چونکە بۆنی رەمزی لە بۆنی ئەو جگەرەیەدا دەبینمەوە... چاوتان لێیە (لەم کاتەدا پاکەتەکەی بەدەستییەوەیە و دەستی بەرز دەکاتەوە وەک ئەوەی نیشانی خەڵکی بدات)، ئێستا هەمان ئەو جگەرەیە دەکێشم کە رەمزی پێش هاوسەرگیریمان دەیکێشا... بەڵام ئەم جگەرەیە و بۆنە ناخۆشەش ناتوانن قەرەبووی تەنیاییم بکەنەوە... هیچ شتێک لە دونیادا ناتوانێت ببێت بە رەمزی... زۆرجار کە دەڕوانمە رۆژانی رابردوو و سەردەمی گەنجیم، پێدەکەنم و هەندێجاریش دەگریم... دەگریم بۆ ئەو ساتانەی لەسەر پێکانی خۆم دەوەستام... دەگریم بۆ راوە ماسی و پیاسەی ئێواران و بۆنکردنی گوڵەکانی باخچە گشتییەکە، دەگریم بۆ ئەو یادەوەرییانەی لەگەڵ شیعرەکانی ئەدگار ئالن پۆ و پۆشکین و ولیەم بلەیک هەمە، دەگریم بۆ ساتی دەستپێکردنی رۆمانی پیرەمێرد و زەریای ئێرنێست هەمەنگوای و دانچەرمووی جاک لەندەن و زۆری دی... دەگریم بۆ ساتی نائومێدی گلگامش وەختێ بەدوای نەمریدا دەگەڕا... دەگریم بۆ ئەو رۆژەی بەدبەختی رووی تێکردم و رەمزی بۆ هەمیشە ماڵئاوایی کرد و منی سپاردە تەنیایی... ئای تەنیایی چۆن ناخی کردووم بە بەستەڵەکی ترس... جارجاریش دڵخۆشی خۆم دەدەمەوە و دەڵێم ئەوی ئەوە نییە سالآنێکی زۆر لە ئاسوودەیی و بەختیاریدا ژیایت، بەخۆم دەڵێم ئەی تۆ نەبووی خۆشی و چێژی ژیانت لەدەست لەملانێی رەمزیدا بینی... ئا، من بووم سواری پشتی بەلەمی خۆشنوودی بووم و بە سەوڵی چێژەوە دەریاکانی زەمەنم

دەبڕی... (مژێک لە جگەرەی دەدات و تەماشای سەعاتەکەی دەستی دەکات)، وا زیاتر لە نیو سەعاتە من لەم بەر سەرمایە چاوەڕوانی ئەو ناموبارەکەم و ئەویش رەنگە ئێستا بەدیار بەرنامەیەکی رادیۆوە، یان هەواڵەکانی سەعات دەی تەلەفزیۆن دانیشتبێت و منی لەیاد چووبێت. ناهەقیشی ناگرم ئەو چەند ساڵێک لە من گەورەترە... جاربەجار کچەکەی دێت سەری لێ دەدات... بەڵام ئەوەشم لەبیر ناچێت کە کاتێ هاوسەرەکەی لەدوا ساتی ژیانی بوو، کچەکەی داوا لە باوکی دەکات کە دەستبەرداری ژیان بێت!، داوای لێدەکات کۆڵ بدات و چیتر ململانێی مەرگ نەکات و با ژیان تەسلیم بکات، هەرچەند هانا ئەو هەڵوێستەی پێخۆش نەبوو، بەڵام چارەشی نەبوو و دواجار باوکە لەسەر بڕیاری کچەکە کۆڵ دەدات و واز لە خواردنی حەبەکانی دێنێت و کۆچی هەتاهەتایی دەکات. هانا هێشتا باشە و وەکو من تەنیا نییە. من نە منداڵ و نە کەسوکار... جگە لە تەنیایی کەسی ترم نییە... تەنیاییش ماڵی ئاوا نەبێ خۆ جێمناهێڵێت... جاران براکەی رەمزی دەهات سەری لێدەداین و ئێمەش دەچووین بۆ لایان، بەڵام ئەوا ماوەیەکی زۆرە دیار نییە و هەواڵی نازانم... چاوەکانم کز بوونە و توانای خوێندنەوەم نەماوە، ئەو رۆژە لە کتێبفرۆشەکەی ناو ئەم باڵەخانەیە ویستم رۆمانێک بکڕم، کەچی بە چاویلکەشەوە بۆم نەخوێنرایەوە و ناچار دەستبەرداری کڕینەکە بووم... ئێستا لەمەودوا ئاگاداری داهێنانی ئەدەبی نووسەران نابم و ناتوانم چیتر لەناو خەیاڵی نووسەراندا گوزەر بکەم... (جگەرەکەی دەخاتە ناو تەپڵەکی جگەرەکە)، ئەم هانایە بۆ وای لێکردم خۆی جەغتی لێم دەکردەوە کە سەعات دە لێرە بم و کەچی خۆی نەهات... تۆ بڵێی... نا تۆبڵێی ناوێ لەبەرچاومە وا گۆرەویە ئەستوورەکانی لەپێدایە و گۆچانەکەی بەتەنیشتەوەیە و خەریکی شۆربا خواردنە... ئەم ژنە هەتیوە نازانم بۆ ئەوەندی حەزی لە شۆربای بڕۆکلییە... کاتی خۆی بەگەنجیش باوکی کێڵگەی بڕۆکلی و گێزەری هەبووە و هەر بڕۆکلی و گێزەری خواردووە... ئەی نەتدیوە ئێستاشی لەگەڵدا بێت چاوەکانی وەک چاوی پشیلە دەبریسکێنەوە و ئەڵێی فسفۆڕیان تیا زاییوە... ئەو مردوو نەمراوە ئێستاش بڕوای بە مرۆڤی باڵا هەیە و پێیوابوو گەڕان بەدوای مرۆڤی باڵا گەڕانە بەدوای ئەو راستییانەی کە لە گومان پێکهاتوون... هەر کاتێکیش باسی پۆشکینم بۆ بکردایە ئەو چل دەمە دەیگووت پۆشکین و شاعیران لە کۆمارەکەی من و ئەفلاتوندا جێیان نابێتەوە. (ئاوڕێکی تر دەداتەوە)، باشە سەیرە بچمەوە ژوورەوە تاقیبێکی بکەم یان نا... نا با نەچم با لێم تووڕە نەبێت و دڵی بشکێت... چونکە هانا بۆ من تاکە مرۆڤێکە هەندێکجار لەو تەنیاییە کوشندەیە هاوەڵیم دەکات... لەبەر ئەوە باشتێک نەکەم

زویر ببێت... دەی بەهەرحاڵ ئەم بارانەش بێتامی کردووە و لێی ناکاتەوە... سەرمای ئێرەش لە زستاندا رێی هاتنە دەرەوەمان لێدەگریت... ساڵێک زوو بەفرێکی ئەستوور باری و بۆ ماوەی نزیک بەدوو هەفتە چوونە دەرەوە زەحمەت بوو... ئەو ماوەیە لەگەڵ رەمزی هەنگوناویترین رۆژەکانی پێکەوەبوونمان بوو.
(بێدەنگییەک... سەری دادەخات و دەنگی مەکینەی ئۆتۆمبێلێک دەبیسترێت... سۆزان سەری بەرز دەکاتەوە)، دەبینێ ئەمبیولانسێک لەبەردەم باڵەخانەکە وەستا... ئەم هەر لە گەزیبۆکە لەسەر کورسییە پێچکەدارەکەی لە چاوەڕوانی هانایە... پاش نزیک بە پێنج دەقیقەیەک پەرامێدەکان ئافرەتێکیان پێیە و خستیانە ناو ئەمبیولانسەکە و بەپەلە و ویقەویق بەردەم باڵەخانەکەیان بەجێهێشت... دواتر کارمەندێک کە هەر لە دوورەوە دەنگی دەبیسترێت دەڵێ "ئەوە هانا بوو لە خۆ ئامادەکردن بوو بێتە دەرەوە، بەڵام بەداخەوە جەڵتە لێی دا و مرد".
سۆزان دڵی داخورپا و (وەک ترساوێک لەسەر کورسییە پێچکدارەکە خۆی گرمۆڵە دەکات) و رووناکی لەسەری کز دەبێت.

**تێبینی**: ئەم شانۆگەرییە لەڕۆژدا روویداوە، بۆیە تەواوی کێشە تەکنیکییەکانی دەنگ و رووناکی پەیوەستە بە ستایڵ و شێوە بەرخوردی دەرهێنەر بە دەقەکەوە. لابردنی ئیشەکانی رووناکی لە دەقەکەدا ئاساییە.

١٩ی تەممووزی ٢٠١٢
کەنەدا

## دەقی دووەم:
## تارمایی، یان سەرزەمینی بەختەوەری

**کارەکتەرەکان**

**ژن**: تەمەن لە دەوروبەری سی ساڵە. باڵای رێک و بەرزە، قژ خورمایی، چاو رەش. پلەی خوێندەواری دەرچووی ئامادەیی بازرگانییە. جلێکی سادەی لەبەردایە.

**پیاو**: تەمەن نزیک بە سی و سێ ساڵە باڵا مامناوەندییە، قژ رەش دەرچووی زانکۆیە، نووسەرە و زۆر چلێسە. قات و بۆینباخی لەبەرە. ریش و سمێڵی پاک تاشیوە.

**تارمایی**: بەرگێکی سپی ئاودامانی درێژی لەبەردایە. لەشێوەی مرۆڤە، بەڵام هیچ شوێنێکی دیار نییە، تەنانەت سەریشی داپۆشراوە. تەنها هەردوو چاوی دەبینرێت.

دەنگی هاورێی پیاوەکەیە (دەنگی ئەلوات): ئەم دەنگە زیاتر لەرێگەی تۆمارکردنی پێشوەختەوە ئامادە بکرێت باشترە.

**شوێن**: باخچەی ناو حەوشەی ماڵی ژن و پیاوەیە لە یەکێک لە گەڕەکەکانی شارێکی کوردستانە.

**کات**: ئێوارەیەکی درەنگی دوای نانی شێوانی هاوینی ساڵی ٢٠٠٦-ە.

### پەردە لادەدرێت
### دیمەنی یەکەم

شانۆ بەجۆرێک نەخشەسازیی بۆ کراوە، کە وەک باخچەی ناو حەوشەی ماڵی ژن و پیاوەکە بنوێنێت. لای پشتەوەی شانۆ دەرگایەک هەیە بۆ ژووری دانیشتن دەچێ و پەنجەرەیەکی بە تەنیشتەوەیە و لای چەپی شانۆش دەرگایەکی تر هەیە بەرەو دەرەوەی حەوشە. لای راستی شانۆ تۆزێک تاریکە و بە رووناکییەکی کەم داپۆشراوە. ژن و پیاوەکە لەسەر دوو کورسی پلاستیک دانیشتوون و مێزێکی بچووکیان لەنێواندایە کە کۆمەڵێ میوە و دوو قاپ و

کەوچک و چەقۆ و سوراحیەک و دوو پەرداخی لەسەرە. ژنە و پیاوە بەدەم میوە خواردنەوە خەریکی قسەکردنن. مۆسیقایەکی نەرم دەبیسترێت و لەگەڵ گیرسانەوەی وردە وردەی رووناکی لەسەر ژن و پیاوەکە، مۆسیقاکەش کز و کزتر دەبێت تا بەتەواوەتی خامۆش دەبێت.

**پیاو:** (بەدەم دەست بردن بۆ بۆڵە ترێکەی بەردەمیان)، من خۆم ئەزانم چۆن پەیدای دەکەم. (دەنکە ترێیەک دەکاتە دەمییەوە)، لەم جۆرە کارانە خاراوم... تۆ خەمت نەبێت.

**ژن:** خەمی چیم نەبێت. (دەست دەبات بۆ قاپ و چەقۆکەی بەردەمی سێوێک هەڵدەگرێت و دەست دەکات بە پاککردنی)، ئەمڕۆ دەستبردن بۆ کارێکی وا دژوارە. تۆ بەردەوام کارە تەمومژاوییەکانت لەلایەکەوە گومانم لا دروست دەکەن و لەلایەکی تریشەوە نا ئارامیم پەرە پێدەدەن. (وچانێک) ئەترسم تووشی گێچەڵێک بێت.

**پیاو:** (بەدەم ترێ خواردنەوە) کچێ تۆ خۆت ترسنۆکیت و وا دەزانیت سەرکردن بە دەرگا داخراوەکان ئەبێتە مایەی مل پەڕاندن. (ژن قاژێک سێو بۆ پیاوەکە درێژ دەکات و ئەویش وەریدەگرێت)، من لە هەوڵی ئەوەدام نائارامیت بڕەوێنمەوە چاوەکەم! بەدوای خۆری بەختەوەری ئەمماڵەوەم. (سێوەکە دەئاخنێتە دەمیەوە). تۆ پێم بڵێ دەتوانم دەرگا داخراوەکان واز بکەم، یان نا؟

**ژن:** (لەگەڵ ئەوەی نەشمیلانە سێو دەخوات و خەمێکیش بە روخسارییەوەیە)، من تا ئێستا لە هیچ تاقیکردنەوەیەکدا تۆم نەبینیوە تا بزانم دەتوانی، یان نا؟ بەڵام عیشقێک لەناختدایە رەنگە بە گڕی ئەو عیشقەوە بتوانی بەستەڵەکی بیابانی خەونەکانی ببڕیت. رەنگە ئەو ئەوینە بەو ئاواتانەت شاد بکات کە ئۆقرەی لێ بڕیوی.

**پیاو:** (چەپڵە لێدەدات و بەدەنگی بەرز) گیان بەدڵمە... بیڵێ. راستیان گووتووە "دوو گا پێکەوە لە دۆڵێک دابنرێن، نەچنە پێستی یەک، ئەچنە خوڵقی یەک". لەڕووی تۆدا نەبێت. بڕوا بکە وام زانی رستەی ناو چیرۆکێکم بۆ ئەخوێنیتەوە. زۆر نەمئەزانی ئەتوانی شاعیرانە بدوێی.

**ژن:** (بڕێک شەرمەزار و پێکەنینێکی کورتخایەن)، بزانە ئەمەش ناکەیتە فەزڵی خۆت! تۆ خۆت بە رۆشنبیر دائەنێی و پێشبینی ئەوە لە ژنێک ناکەی دوو دێڕی جوان بڵێت. (لەخۆبایبوونێکی پێوە دیارە) ئێ خۆ نەخوێندەوار نیم. ئەوە راستە ناخوێنمەوە، بەڵام بایی خۆم گوێ ئەگرم و هەست رائەگرم.

**پیاو:** (خەجاڵەتە و تۆزێک نائارام دەبێ)، نا چاوەکەم وشەکانتم پێ جوان بوو. من شانازیت پێوە ئەکەم کە بەوجۆرە دەدوێی. (مۆبایلەکەی لە گیرفان دەردەهێنێت و یەک دوو جار دەست لە دووگمەکانی دەدات و لەسەر مێزەکەی بەردەمی خۆی دادەنێ)، ئەزانی چەند خۆشە هاوسەرەکەت فانتازیای بەهێز بێت و ئەدەبیانە بدوێت. من چێژ لەوە دەبینم.

**ژن:** (زویر بووە و بە نازەوە) ئێوەی پیاوان تێڕوانینەکانتان لەسەرتان واوەتر ناچێت. (قاپ و چەقۆکە دادەنێتەوە سەر مێزەکە و قاچ دەخاتە سەر لاق و تەنیشت لە پیاوەکە دەکات)، پێم سەیرە تۆ نووسەریت و چۆن دەبێ وابیت؟ تۆ بڵێی نووسەرانی تریش لەماڵەوە وابن؟ من هەندێکجار هەڵسوکەوتی کابرایەکی نەخوێندەوار لە رۆشنبیرێکی خۆپەرست بەباشتر دەزانم.

**پیاو:** (برێک نارەحەتە)، ئێ کچی باش خۆ کفرم نەکرد. نازانم بۆ هاندانەکانم بە خراپی لێک ئەدەیتەوە؟ (پەرداخێ ئاو تێدەکات و بۆ ژنەکەی درێژ دەکات)، فەرموو ئاو بخۆرەوە و پاڵەپەستۆت بهێنە خوارەوە. (هەندێک کورسییەکەی لە کورسی ژنەکە نزیک دەکاتەوە)، گوڵی من تۆ مایەی ئاسوودەیی منیت، تۆ هەوێنی خۆشەویستی منی، تۆ هەتاوی ژیانمی. توخوا بەس زویر مەبە، چونکە من ئەمرۆژانە هەموو هەست و هۆشم لای گەیشتنە بە خەونە گەورەکەم.

**ژن:** (بە پێکەنینێکی گاڵتەئامێزانەوە) خەونە گەورەکەت؟ کام خەون؟ تۆ مامۆستایت و مووچەیەکت هەیە و جاربەجاریش دەنووسیت و پاداشت (خەلات) لە گۆڤار و رۆژنامەکانیش وەردەگریت. بەجوانی گوزەرانمان دەچێت بەڕێوە و ئیتر بۆ واز لەو خەون و مەونانە ناهێنیت؟

**پیاو:** (لە ژنەکە دوور دەکەوێتەوە و هەڵدەستێتە سەر پێ و رووی لە بینەرانە و بێزاریی بە سیمایەوە دیارە)، ئاخر تۆ لە ناوەرۆکی خەونەکەم ناگەیت. من بەنیازم سەفەرت پێ بکەم بۆ سەر زەمینی بەختەوەری. بتگەیەنم بەو وێستگانەی کە تا ئێستا بوارت نەبووە هەر بیریشیان لێ بکەیتەوە. من ئەزانم رێگاکەم پێچاوپێچە و نوشوستی و گلانی تێدایە و گەر بەجیددی هەوڵبدەم لەوانەیە سەربکەوم. ئەوکات تاریکایی ژیانمان ئەڕەوێتەوە و خۆری بەختەوەریمان بۆ هەتاهەتایە هەڵدێت. (بێدەنگییەکی کورت)، لەبیریشت نەچێت دەتکەمە شاژنی ناو بنەماڵەکەمان.

**ژن:** (سینییە میوەکە هەڵدەگرێت و بەدەم رێکردنەوە بەرەو دەرگای

ژووری دانیشتن) دەی فەرموو با بزانین چۆن ژیانمان رووناک دەکەیتەوە و چاوەڕێشم بمکەیتە شاژنی بنەماڵە.

(پیاوەکەش بە دوای ژنەکە دەچێتە ژووری دانیشتن و شانۆ تاریک دەبێت)

## دیمەنی دووەم

شانۆ لەشێوەی ژووری دانیشتن سازکراوە. یەک دوو قەنەفەی کۆن و دوو کورسی دار و مێزێکی قاوەی لە دار دروستکراوی لێیە کە گوڵێک و هەندێ کتێب و گۆڤاری لەسەرە. یەک دوو وێنە بەدیواری پشتەوەی شانۆ هەڵواسراون. رووناکی بەچڕی شانۆی داپۆشیوە. پیاو بە تەنهایە لە ژوورەکەیە و سەری بەسەر مۆبایلەکەی داخستووە و خەریکە ژمارەیەک لێئەدات.

**دەنگی هاوڕێی پیاو**: ئەلو... ئەلوات... قسە ئەکات... فەرموو.

**پیاو**: (مۆبایلەکەی بە گوێوەیە) ئەلو... مەرحەبا قوربان... تەندروستیتان چۆنە کاک ئەلوات؟ برادەران چۆنن؟ گووتم بەخوا کاک ئەلوات بێڕەحم بووە و ئێمەی لەبیر نەماوە. (پشوویەکی کورتخایەن) دەڵێم ناوەخت نەبوو زەنگم بۆ لێدای؟

**دەنگی هاوڕێی پیاو**: مەرحەبا لە خۆشتان کاک بەدوێژ... من زۆر باشم و برادەرانیش هەواڵت ئەپرسن. (وچانێکی کورت) نا... نا... بۆ تۆ ناوەخت نییە و هەمیشە کاتمان هەیە.

**پیاو**: (شڵەژانێکی پێوە دیارە) سوپاستان ئەکەم و سوپاسی ئەو برادەرانەش ئەکەم. زۆرم بیر ئەکردی و گووتم با تەلەفۆنێکی بۆ بکەم و هەواڵی بپرسم.

**دەنگی هاوڕێی پیاو**: سوپاست ئەکەم و لە چاکەی خۆتەوەیە... خۆت دەزانی زۆر سەرقاڵم و هەفتەی رابردوو لە وڵاتی تورکیا گەڕامەوە و بڕوا بکە هێشتا فریای ماڵی غەزوورم نەکەوتووم.

**پیاو**: ئینجا قوربان ئێوەومانان بەرپرسیارێتیتان لەسەرشانە و ئەرکتان قورسە و رۆژ تا ئێوارە لەپێناو ئەو میللەتە (دەست دەکات بە هاتوچۆ بەناو ژوورەکەدا)، زەحمەت ئەکێشن و ئەو وڵات و ئەو وڵات ئەکەن... بەخوا ماندوون، خوا دەست بەتەمەنتانەوە بگرێت.

**دەنگی هاوڕێی پیاو**: سوپاست ئەکەم و خۆزگە هەموو کەس وەکو تۆ لە ماندووبوونی ئێمە تێبگەیشتایە. بۆنێکیشم لە تورکیاوە بەدیاری بۆ هێناوی

و باسی دامەزراندنیشم کردووی لەگەڵ ڕێزدار بنگیس و بەڵێنی داوە بەپێی ئیستحقاق و دڵسۆزیت لەجێگەی شیاوی خۆت دابنێت.

**پیاو:** (دڵخۆشە و بزەی لەسەر لێوانە)، دونیایەک سوپاس قوربان... زۆر مەمنوونم... من لەخزمەتدام و هەمیشەش خزمەتکاری دڵسۆزی ڕێزدار بنگیس و ئێوەم. (شاگەشکەیەتی) ئەم پیاوەتییەی تۆشم تا مردن لەیاد ناچێت.

**دەنگی هاوڕێی پیاو:** شایانتە... شایانتە. ڕێزدار بنگیس ڕۆشنبیری وەکو تۆی خۆش دەوێ. ئەو ڕۆشنبیرێکی زیرەکی وەکو تۆی پێ شۆڕشگێڕە کە بەردەوام هەوڵ دەدەی مێژووی میللەتەکەمان و بنەماڵە بەڕێزەکەیان بەرز ڕابگری و ستایش بکەی. (دەنگی تۆزی نزمتر دەبێتەوە)، بەینی خۆشمان بێ وای بەچاک ئەزانم زنجیرە وتارێک لەسەر ڕێزدار بنگیس بنووسی و باس لە شەهامەتی بەڕێزیان بکەیت. زوو ئەم کارە بکە و دامەزراندنەکەت مسۆگەرە.

**پیاو:** (بەدەم قسەکردنەوە هەر ئەڵێی لەبەردەم جەنابی ڕێزدار بنگیسە و خێرا خێرا کڕنۆش ئەبات)، من خزمەتکارم و خۆم و پێنووسەکەم چیمان پێ بکرێت درێخی ناکەین. ئەوان ڕاستین و ئێمەش ڕەنگدانەوەی ڕاستین. ئەوان کۆڵەکەی مێژوون و ئەگەر ئەوان نەبوونایە ئێستا میللەتەی ئێمە هەر لە دەبەنگی دەژیا. (لەناکاو دەوەستێت) هەر ئەمشەو دەست بە نووسینی ئەو زنجیرە وتارە دەکەم.

**دەنگی هاوڕێی پیاو:** وایە... وایە... کاکە بەدوێژ قسەکانت جوانن. دەستت خۆش بێ و دەست پێ بکە. من ئەبێ بڕۆم و هەندێ کارم هەیە و بەڵام لەبیرت ناکەم.

**پیاو:** (بڕۆی تێکئەنێ) تا مردن سوپاسگوزارم... قەت ئەم چاکەیەم لەبیر ناچێت. سوپاس بۆ کاتت و یەک دوو ڕۆژی تر تەلەفۆنت بۆ ئەکەمەوە.

دەنگی هاوڕێی پیاو: چاکە... جارێ خواحافیز...

**پیاو:** خوات لەگەڵ قوربان... شەوت شاد بێ و هەر ئاسوودە (تەلەفۆنەکە لەلایەن دائەخرێت و پیاوەکە تەماشایەکی تەلەفۆنەکەی دەستی ئەکا و هەست بە تەریقبوونەوە ئەکات) بیت... هەر ئاسوودە بیت و هەزارجار شەوت شاد ئەی کەشتی پەڕینەوەم لە دەریای نائومێدی و دەستکورتی. ئەی بەهاری نێو زستان و بەستەڵەکم... شەوت شاد ئەی هەتاوی نێو تاریکستانی ژیانم... (لەم کاتەیا ژنەکە دێتە ژوورەوە و پیاوەکە ڕوو لە ژنەکە دەکات)، بەخێر بێی ئەی ژنە شیرینەکەم، ئەی گوڵەباخە گەشاوەکەی نێو گوڵدانی ئەوینم و ئەی لاسکە

ناسکە ژاکاوەکەی نێو ئینجانەی هەژاری... بەڵێن بێ هەموو شەوێک گەشتی لای مانگت پێ بکەم و مانگ خەجاڵەتبار بکەم بە جوانییەکەت.

**ژن**: (لەسەر لایەکی قەنەفەکە دائەنیشێت و بە توانجەوە)، ها ئەوە چییە هاتوهاوارت لەودیوەوە ئەهاتە بەرگوێ... بزانە بە منیش ئەڵێی شاعیرانە قسە ئەکەیت، تۆ ئاگات لەخۆتە ئەڵێی لەسەر مەنەسەوە وتار بۆ هەزاران کەس ئەدەیت و ئەشیرێنی. (سەرزەنشتانە) هەر شێت نەبیت قەیناکە.

**پیاو**: کچێ چۆن شێت نابم لە خۆشیانا کە جەنابی ڕێزدار بنگیس بەڵێنی داوە داممەزرێنێ و شوێنی شیاوی خۆمم بداتێ. کاک ئەلوات ئەم هەواڵەی پێدام... کچێ وەختە لەخۆشیانا بفڕم... (لە نزیک ژنەکەوە دائەنیشێت)، زۆرم نەماوە دەستم لەو گەنجینەیە گیرببێ.

**ژن**: (بە سەرسوڕمانەوە) من تێناگەم بۆچی ئاوا ئۆقرەت لێ بڕاوە. ئەترسم خۆشتی لەسەر دابنێی. تۆ ئەگەر بزانیت یاریی بە ئاگر دەکەیت. وازبێنە و لە کەلی شەیتان وەرە خوارەوە. با نە لە قەل بین و نە لە کۆتر.

**پیاو**: کچێ گیانە تۆ خۆت هەم قەلی و هەم کۆتر... تۆ دەلاقەی هیواکانمی و من ئەم هەموو هەوڵدانەم بۆ ئاسوودەیی و خۆشی تۆیە. زوو زوو گەشتی تورکیات پێئەکەم و ئەچینە کۆریا و لە زێڕت هەڵئەکێشم و ژیانت دەکەم بە هەنگوین.

**ژن**: (خۆشباوەڕانە)، دە مادام وایە ئەبێ خانوویەکی زۆر جوان دروست بکەیت و بەناومی بکەی.

**پیاو**: (بە پێکەنینێکی فێڵبازانەوە)، بەدڵنیاییەوە بەناوتییەوە دەکەم و تاپۆکەی دەخەمە ناو نایلۆنێک و لەژێر سەرینەکەتی دائەنێم تا بەئیستراحەت شەوان چاو لێک بنێی و بنووی.

**ژن**: وەرە بزانە چی ترم دەوێت (قۆڵی پیاوەکە بۆ لای خۆی ڕائەکێشێت)، ئەبێ پشتێنێکی زێڕم بۆ بکڕیت لەگەڵ دوانزە بازنگ و...

(دەنگیان وردە وردە نزم دەبێ و تەنها دەستیان دەجووڵێت و ڕووناکی لەسەریان کز دەبێ و شانۆ تاریک دادێت).

## دیمەنی سێیەم

هەمان دیمەنی پێشووە و دیسانەوە پیاوەکە بەتەنها لە ژوورەکەدایە... دێت و دەچێ و خەریکی بیرکردنەوەیە. تارمایی لە دەرگاکەوە دێتە ژوورەوە.

**پیاو:** (تۆقیوانە ئەکشێتە دواوە) یا ئەڵڵا... ئەوە چییە خۆ زراوم چوو؟ (نقەی لەخۆی بڕیوە و هەر ئەوەتە هەناسە دەدات)، تتتتۆ کێی کابرا ئەڵێی لە قەبرسان هاتوویتەتەوە. ئێ چیت دەوێت؟ خێرە بەم ئێوارەیە سەردانت کردم؟

**تارمایی:** (باسکەکانی درێژ کردوونەتەوە و بە دەنگێکی کەرخ و گەورە دەدوێت)، مەترسە ئەی نووسەر. ئەی ئەو رۆشنبیرەی خەونەکانت خەمی کۆکردنەوەی سامان و سەروەتە. من تارمایی بیرکردنەوەکانتم و نە لە گۆڕستان هاتوومەتەوە و نە هیچ... من لەناو مێشک و خەیاڵی تووە هاتووم. ئەرکمە ئەو رۆشناییەت پێ ئاشنا بکەم کە دەبێتە مایەی رەنگینترکردنی ژیان.

**پیاو:** (دەمی تێک دەئاڵێت)، حاڵی نیم هێشتا... چۆن لەناو خەیاڵ و مێشکی منەوە هاتووی؟ (بێدەنگییەکی کورت) خۆ بیرکردنەوەی من نیت؟ ئەی بیرکردنەوە چۆن لە مێشکەوە دێتە دەرەوە؟ من نەمزانیوە بیرکردنەوە وەکو زەلام بێت. (تف لە گەرووی وشک بووە) خۆ بەنیاز نیت شتێکم لێ بکەیت؟

**تارمایی:** (ناجووڵێت و لە شوێنی خۆی وەستاوە) نا... هیچت لێ ناکەم... من هاتووم رێگای سەرزەمینی بەختەوەریت نیشان بدەم!

**پیاو:** (برێک ترسەکەی دەنیشێتەوە) سەرزەمینی بەختەوەریم نیشان دەدەی؟ (بەپەرۆشەوە) چۆن؟

**تارمایی:** تۆ ئەگەر دەتەوێت بەختەوەر بیت، ئەبێ واز لە هەموو بەهاکانی ژیان بێنیت و بەها جوانەکان ببەخشیتە شتە قێزەونەکان. روخسارە ناشیرینەکان جوان بکەیت و پەردەی تەمێک بدەیتە سەر هەقیقەت. (بێدەنگییەک) ئینجا تا ئەتوانی جەنگە گەورەکان بەرپا بکە. تۆ بۆ ئەوەی بگەیتە مەرامەکانت، ئەبێ ببیتە جەنگاوەری جەنگێکی درێژخایەن.

**پیاو:** (ئێستا بەتەواوەتی ترسی نیشتۆتەوە)، ئەمەوێت روونتر بدوێی.

**تارمایی:** (لە گۆشەی لای دەرگاکەوە ئەجووڵێت و بەرەو لای پەنجەرەکە ئەڕوات)، پێویستە واز لەهەموو ئەو قسە قۆڕانە بهێنیت وەکو میللەت و گەل و پێشکەوتن و شۆڕش و هەژاران و مافی مرۆڤ. ئەبێ دەست بدەیتە جەنگێکی مەزن لەپێناو باجدان بە هەقیقەت، چونکە ئێمە هەموو دەبێت باج بدەین. باجی

ئێمەش بێدەنگ بوون و سەری ڕەزامەندی لەقاندنە لەسەر هەر شتێک کە ڕێزدار بنگیس و بنەماڵە بەڕێز و شۆڕشگێڕەکەیان دەیکەن، یان دەیانەوێت بیکەن. ئەمە ڕێگەی گەیشتنە بە ئاسوودەیی و سەرزەمینی بەختەوەری.

**پیاو:** (بە پاڕانەوەوە) ئێ چی تر؟... تکایە ئامۆژگاریم بکە.

**تارمایی:** تۆ ئامۆژگاریت ناوێت... لەسەر بۆچوونەکانی خۆت سووربە و بکەوە شوێن خەیاڵاتت. وەک گووتم من هەوێنی بیرکردنەوەی تۆم و هاتووم پێت ڕابگەیەنم کە تۆ لەسەر ڕاستە ڕێگای هەقیقەتی و دەگەیتە خەونەکانت.

**پیاو:** (دڵخۆشە و سەیری زەوییەکەی ژێر پێی دەکات و ڕوو وەردەچەرخێنێ و بە بزەیەکەوە ئەم قسەیە ئەڵێتەوە. لەهەمان کاتیشدا تارمایی لە دەرگاکەوە دەچێتە دەرەوە)، دەگەمە خەونەکانم... دەگەمە خەونەکانم... (ئینجا ئاوڕدەداتەوە) ئەی چۆن... بەڵام کەی؟... (تەماشا دەکات تارمایی لە ژوورەکە نەماوە)، ئەوە چیت لێهات؟ بۆ کوێ چووی؟

(ژنە لەم کاتەیا بەپرتاو دێتە ژوورەوە و دەیەوێ بە هانای پیاوەکەیەوە بێت، تا بزانێ چی ڕوویداوە).

**ژن:** (شڵەژاوە) ئەوەتام پیاوەکە... ئەوەتام... ئەوە چییە دیسانەوە چیت لێقەوماوە؟ هەناوم بەربۆوە؟

**پیاو:** (سەری سوڕماوە)، تۆ هەناوت بۆ بەربۆوە خانم... نا هیچ نەبووە تەنها لەگەڵ تارمایی بیرکردنەوەی خۆم قسەم دەکرد. ئەو تارماییەی کە ڕێنیشاندەرمە بەرەو دەربازبوونمان لەم ژیانە سادەیە و چوونمان بەرەو بەرزیی. ئەم تارماییە پەیژەیە بەرەو بڵندیی و خۆشگوزەرانی. ژن: ئەرێ تۆ شێت نەبووی؟ تارمایی چی و حاڵی چی؟ ئەوە بۆ وات لێ بەسەر هاتووە؟ (هێمنتر دەدوێ) تۆزێک پشوو بدە و بۆ وا لەخۆت ئەکەی؟ باسی تارمایی و مارمایی مەکە تا بەشێتیان لەقەڵەم نەداوی!

**پیاو:** نا بەڕاستمە تارماییەک ئێستا لێرە بوو و قسەمان دەکرد و ڕێگای گەیشتن بە سەرزەمینی بەختەوەری نیشاندام. (لەژنەکە نزیک دەبێتەوە) بەڕاستمە ئەو ڕێگای خۆشگوزەرانی نیشاندام.

**ژن:** (سەر با دەدات) کوڕە پیاوەکە واز لەم شتانە بێنە با تووشی کارەساتێک نەبین. لە هیچمان کەم نییە و گوزەرانێکی مامناوەندیمان هەیە و تەنانەت لەزۆر کەسیش باشتر ئەژین.

**پیاو:** (بێگومانانە) نا دڵنیابە، تووشی هیچ نابین و ئەشزانم چی دەکەم. تۆ

خەمت نەبێت. لەم وڵاتە گەر خەمی وڵاتت هەبێت، گەر خەمی مرۆڤبوونت هەبێت، گەر عاشقی ئازادیی بیت و تێبکۆشیت بۆ رزگاری، ئەوا مایەپووچ دەردەچیت و هەر گیرفان بەتاڵ دەبیت. خەبات و شۆڕش و ئازادی و رزگاری بێجگە لە قسەی بۆش و بەتاڵ هیچی تر نین. ئازادیی راستەقینە وا لە گیرفان پڕیدایە و بەختەوەریش وا لە لای رێزدار بنگیسە. من گاڵتەم دێت بەو بێمێشکانەی بەناوی وڵاتەوە خۆیان بەکوشت دەدەن یان ژیان لەخۆیان تێک دەدەن. (لەسەر لایەکی قەنەفەکە دادەنیشێت و روو لە ژنەکە دەکات)... هاوسەرە ئازیزەکەم تۆ پشتیوانم بە، ئەوسا هەموو شتێک بە ئارەزووی خۆمان دەبێت. بێخەم بە، دڵەکەم، بێخەمبە.

**ژن:** (بە دەنگێکی نزم) ئەی من خەمم نەبێت کێ خەمی هەیە؟ شتێک روو بدات هەر لە من دەقەومێت. کە تۆ شتێکت لێ بێت من چی لە ماڵوحاڵ بکەم.

(دەنگ و رووناکی هاوتا و پێکەوە کز دەبن تا شانۆ تاریک دادێت).

## دیمەنی چوارەم

**کات:** سەرلەبەیانی رۆژێکی پاییزی ساڵی ٢٠٠٦-ە.

**شوێن:** نووسینگەی تازەی پیاوەکەیە.

**دیمەن**

شانۆ لە شێوەی نووسینگەیەکی قەشەنگ دیزاینکراوە. رووناکی لەسەر پیاوەکەیە لە نووسینگە تازەکەی لەسەر ئەسکەمیلێکی چەرمی رەش دانیشتووە و مێزێکی گەورەی لەبەردەمە و ناویشی وەک بەڕێوەبەری ئەو فەرمانگەیە نووسراوە. مێزەکە لاپتۆپێک و مۆبایلێکی گرانبەهای لەسەرە. کۆمەڵێ کاغەزی لەبەردەمدایە. ئەمە بێجگە لە قەڵەم و پێداویستی تر. پیاوەکە زۆر دڵخۆش دیارە و پێدەچێت بە بەشێک لە خەونەکانی گەیشتبێت. مۆسیقایەکی گونجاو لەگەڵ ئەتمۆسفیری نووسینگەکە دێتە بەر گوێ. وردە وردە دەنگی مۆسیقاکە کز دەبێ و زەنگی مۆبایلەکە لێدەدات.

**پیاو:** (مۆبایلەکە ئەگرێتە گوێچکییەوە) ئەلو... بەدوێژ فلان قسە ئەکات.

**دەنگی هاوڕێی پیاو:** بەیانی باش کاک بەدوێژ لەگەڵ ئەم جێگا تازەیەت چۆنی؟ بەدڵتە؟

**پیاو:** (بەنەوازشەوە) زۆرباشم کاک ئەلوات... بەڕێزیت... قوربان... بچووکتانم... لەسایەی هەوڵ و کۆششەکانی جەنابتەوەیە من لێرە دانیشتووم... بەڕاستی نازانم چۆن ئەم چاکەیەت بدەمەوە؟

**دەنگی هاوڕێی پیاو:** (لەسەرەخۆ) نا... نا... وا مەڵێ، من هەمیشە حەزم کردووە یارمەتیت بدەم.

**پیاو:** ئەزانم قوربان ئەزانم... خۆزگە ئیشێکت تێم بکەوتایە و منیش بەسەر سەر و چاو بۆم جێبەجی بکردیتایە و بمتوانیایە تۆڵەی ئەو پیاوەتییە گەورەیەت بۆ بکەمەوە.

**دەنگی هاوڕێی پیاو:** من قەت گومانم لە دڵسۆزیت نەبووە و بە ڕێزدار بەنگیسیشم گووتووە.

**پیاو:** من خزمەتکارتانم... دڵسۆزتانم... ئامادەی هەموو قوربانییەکم لەپێناو خۆشی و سەرکەوتنی ڕێزدار بەنگیس و ئێوە.

**دەنگی هاوڕێی پیاو:** (دوو دڵییەک بە قسەکانییەوە دیارە)، دە مادام وایە تەنها یەک کارم پێتە گەر بتوانم بۆمی جێبەجێ بکەیت.

**پیاو:** (بەپەرۆشەوە) لە خزمەتتام... هەر کارێک بۆ جەنابتان بێ بەسەر سەر و بەسەر چاو.

**دەنگی هاوڕێی پیاو:** دەباشە لەسەر مکوڕبوونی خۆت ئەم ئیشەمان بۆ جێبەجێ بکە... (وچانێکی کورت) بەو خاتوونە قەشەنگە بڵێ با شەوێکی سوورمان لەگەڵدا بەرێتە سەر؟

**پیاو:** (لەسەر کورسییەکەی هەڵدەستێتە سەر پێ و دێتە بەردەم مێزەکە و بە سەرسوڕمانەوە) چی... چیت گووت قوربان؟ خاتوون؟ کێ؟

**دەنگی هاوڕێی پیاو:** ئەو خاتوونەی لە نهۆمی دووەمی نووسینگەکەت خەریکی کاری کۆمپیوتەرە... ئەو قژ مێشکراوەکە ناوی چی بوو؟

**پیاو:** (بە سەرسوڕمانەوە) خاتوو بۆرژان ئەڵێی؟

**دەنگی هاوڕێی پیاو:** ئا... بەڵێ... خۆیەتی... ئەمانەوێت شەوێک لەگەڵمان بێت.

**پیاو:** بەڵام ئەو خاتوونە خێزاندارە و... ئێ ئاخر چۆن بتوانم (قسەکانی باش بۆ ناکرێ و تاساوە) ڕازی بکەم؟ قوربان ئەو خاتوونە گاڵتەی بە پیاو و میاو دێت.

**دەنگی هاوڕێی پیاو:** ئەگەر ڕازی نەبوو بە بیانوویەک دەری بکە. بەس

نەهێڵیت کەس هەستت پێ بکات.

**پیاو:** (سەر دەلەقینێ) باشە بەسەرچاو... خزمەتکارتانم قوربان.

**دەنگی هاوڕێی پیاو:** دەی باشە دوایی ئاگادارم بکەرەوە بزانم شێریت، یان ڕێویت.

**پیاو:** (بەسەر لەقاندنەوە) بەسەرچاو ئاگادارتان ئەکەمەوە.

(پیاوە مۆبایلەکەی دادەخات و بە دوو پەنجەی چەناگەی خۆی دەگرێت و بەدەستی جووڵەیەک دەکات، کە هێمای ئەوەیە بچێت داواکەی هاوڕێکەی جێبەجێ بکات، بەرەو دەرگاکە هەنگاو دەنێت و مۆسیقایەکی گونجاو لەگەڵ ئەو دۆخە دێتە بەر گوێ و ڕووناکی لەسەر شانۆکە کز دەبێ).

**پەردە دادەدرێتەوە**

کۆتایی مانگی تشرینی یەکەمی ٢٠١١
ڤانکۆڤەر- کەنەدا




# نووسینی سیناریۆ بۆ فیلم، یارمەتیدەرم بووە بۆ ئەوەی لە کورتەچیرۆکەوە بچمە ناو دنیای رۆمان

● سازدانی: شەهرام عەبدوڵڵا

مۆنیرو رەوانیپور ساڵی ١٩٥٤ لە جفرەی سەر بە پارێزگای بوشەهر هاتووەتە دنیا، خوێندنی سەرەتایی و ئامادەیی لە بوشەهر تەواو دەکات و لە زانکۆی شیرازیش بڕوانامەی بەکالۆری لە دەروونناسی بە دەست دێنێت، بۆ درێژەدان بە خوێندن دەچێتە ئەمریکا و لە زانکۆی ئیندیانا لە زانستی پەروەردە بڕوانامەی ماستەر وەردەگرێت.

رەوانیپور لە ساڵی ١٩٨٠ دەست بە نووسینی چیرۆک دەکات و یەکەم کتێبی واتە (کەنیزو) لە ساڵی ١٩٨٧ بڵاودەکاتەوە و دواتریش کۆمەڵێک کورتەچیرۆک و رۆمان ...، چیرۆکی رەعنا لە کۆمەڵە چیرۆکی (نازلی)، ساڵی ٢٠٠١ خەڵاتی ئەدەبی گوڵشیری پێ بەخشرا. رەوانیپور لە دیسەمبەری ٢٠٠٧ەوە لەگەڵ خێزانەکەی لە ئەمریکا دەژی.

دەربارەی رەوانیپور دەوترێت؛ هەرچەند شێواز و زمانی نووسینی لەگەڵ

تێپەڕبوونی کات گۆڕانی بە سەردا دێت، بەڵام خەمەکانی جێگیرن، رەگەزە تایبەتەکانی چیرۆک، زاڵبوونی سروشت بە سەر کەش و هەوای چیرۆکدا، رۆڵی بەرچاوی ژنان، ئەمانە هەر لە یەکەم کتێبییەوە ئامادەییان هەیە و هەندێک لە کەسایەتییەکانی وەک (گوڵپەر) و (مریەم) لە چیرۆکە جیاجیاکانیدا دووبارە دەبنەوە.

رۆمانەکانی بریتین لە:

اهل غرق، دل فولاد، کولی کنار اتش.

کورتەچیرۆکەکانیشی:

کنیزو، سنگهای شیگان، سیریا سیریا، زن فرودگاه فرانکفورت، نازلی.

هەروەها چیرۆک بۆ منداڵان:

گنجشک و اقای رئیس جمهور

ترانەهای کودکان

## مۆنیرو رەوانیپور: خوێندنەوە هەمان نووسینە

**چیرۆک لای تۆ چۆن دروست دەبێت؟**

جاری وایە بە دەنگێکی وەهمی و ناڕوون، وێنەیەک یا بەسەرهاتێک، تەنانەت جوڵەی دەستێک و هەر شتێکی دروستکەری وەهم، چیرۆکی (سیریا سیریا) بینینی تان و پۆی جلێکی ژنانەی ناوچەیی کە لە دەوەنە دەڕکاوییەکانی دەروپشتی گوندی (ئەخەند) ئاڵابوو، بە ئەنجامی گەیاند.. بەڵام زریان و دەریا و شەپۆلەکانی بەردەوام لەگەڵ خۆیان چیرۆکیان بۆ هێناوم، بەردەوام.

**جیاوازی لەنێوان نووسینی نووسەرانی پیاو و ژن لە چیدا دەبینیت؟**

جیاوازی هەمیشە بوونی هەیە، جیاوازی لەنێوان نووسینی دوو نووسەری ژنیشدا هەیە، هەر نووسەرێک بەو ئاگایی و ئەزمون و ئەندێشانەی هەیەتی لە قۆناغێکی تایبەتی مێژووییدا دەنووسێت، روانینی هەر نووسەرێک بۆ جیهانی دەورووپشتی جیاوازە، کەواتە سروشتییە نووسینەکان جیاواز بن و جوانی ئەدەبیش هەر لەوەدایە.

**زیاتر هۆگری کام بابەتانەیت؟**

هەر بابەتێک کە پێوەندی بە مرۆڤەوە هەبێت و پێوەندی هەبێت بە کێشمەکێشمەکانی بۆ بیناکردن و مانەوە و عاشقبوون و بەگشتی رووبەڕووبوونەوەکانی لەگەڵ ستەمکاری، لەگەڵ ستەمکاری کۆمەڵایەتی و دەوڵەتی و خێزانی و ستەمکاری سروشت و ...

**لە چیرۆکەکانتدا بە تایبەت لە رۆمانی (اهل غرق)دا زۆر کەڵک لە ئەفسانە و باوەڕە خۆجێییەکان وەردەگریت و هەندێک پێیانوایە ئەمە لەژێر کاریگەری گابریل گارسیا مارکیزدا بووە خۆت لەمبارەیەوە چۆن بیردەکەیتەوە؟**

من پێموایە کچێک کە تا تەمەنی ١٠ساڵیی لە گوندێکی کەنار دەریادا، شایەتحاڵی گرمە و ناڵەی دەریا و نوقمبوونی راوچییەکان و کرێکاری کەشتییەکان و خۆڕاگریی و تەسلیمبوونی مرۆڤەکان بووە لە بەرامبەر سروشتدا، ئەم کچە کاتێک گەورە دەبێت ئەم چیرۆکانە دەنووسێت چونکە گوندییە، وەک ژنانی جفرە و باشور (باشوری ئێران) خەیاڵ و ئەفسانە دەهۆنێتەوە. پێموایە ئەم کچە کاتێک گەورە بو و لە زانکۆ (سەد ساڵ تەنیایی مارکێز)ی خوێندەوە، زانی کە ئەویش دەتوانێ باس لە ژیانی منداڵی



کۆچ کارێکی ئاسان نییە، بەڵام لێرە کەس کاری بە نووسینەکانی من نییە، عەرزوگەز فراوانە، دەتوانی بە دڵی خۆت بە فارسی بنووسیت و بڵاویبکەیتەوە، ئەگەریش دەتوانی بە ئینگلیزی بنووسە، پێموایە لە ئێران ئێمەیان دورخستبۆوە بۆ سوچی خانوەکانمان



خۆی بکات بێ ئەوەی بترسێت یا شەرم بکات.

**چون بۆ ئەمریکا و دورکەوتنەوە لە زمانی فارسی چ کاریگەرییەکی لەسەر داناویت؟**

کۆچ کارێکی ئاسان نییە، بەڵام لێرە کەس کاری بە نووسینەکانی من نییە، عەرزوگەز فراوانە، دەتوانی بە دڵی خۆت بە فارسی بنووسیت و بڵاویبکەیتەوە، ئەگەریش دەتوانی بە ئینگلیزی بنووسە، پێموایە لە ئێران ئێمەیان دورخستبۆوە بۆ سوچی خانوەکانمان. بۆ من، هاتن بۆ ئەمریکا بە هەموو گرفتەکانییەوە دەستپێکێکی تازەیە، ئێستا دەزانم نووسەرم و نووسەربوون مانای چییە. خەریکە سەرلەنوێ خۆم دەناسمەوە.

**کە دەست بە نووسینی چیرۆکێک دەکەیت دەزانی بە چی کۆتایی دێت؟**

ئەوە بەستراوە بە چیرۆکەکەوە لە (کولی کنار اتش)دا دەمزانی بەرەو کوێ دەچێت، بەشی کۆتایی لە زەینمدا نووسرابوو. بەڵام (اهل غرق) لەگەڵ خۆی دەیبردم، هەندێکجار چیرۆک لە نیوەدا دەگۆڕێت، زۆر جار کەسایەتییەکانی چیرۆک لە نووسەر زیندووترن، جاریوایە کەسایەتییەکان کۆمەڵێک شتم فێر دەکەن کە پێشتر نەمزانیوە.



## بزووتنەوەی فیمینیزم بزووتنەوەی لایەنگری مافەکانی ژنانە و هەر جوڵانەوەیەکیش لە پێناو مافەکانی ژناندا هەنگاو بنێت، بڕوام پێیەتی



**بە کۆمپیوتەر دەنووسیت؟**

(نازلی)، دوایین کارم بوو کە ڕەشنووسی یەکەمیم لە سەر کاغەز نووسی، دواتر هەرچیم نووسیوە بە کۆمپیوتەر بووە.

**تۆ سیناریۆت بۆ فیلمیش نووسیوە و هەندێکیان کراون بە فیلم، لە بارەی ئەوانەوە قسەمان بۆ بکە؟**

بەڵێ؛ ئەو کاتانەی لە کۆمپانیای (ایران کاست) کارم دەکرد، بیناکەی بەرامبەرمان، نووسینگەی (هیدایەت فیلم) بوو، ڕۆژێک پێم وتن چیرۆکی زۆرم لایە و دەستم کرد بە نووسینی پلانی سیناریۆی فیلم و دە پلانم بۆ نووسین کە بردیان بۆ (دامەزراوەی فارابی)، دیارترینیان (سیناریۆی فیلمی ئاو) بوو کە لە سەر بەرهەمهێنانی، شەڕ و ناوخۆشی زۆر دروست بوو، من دەمویست دەرهێنەرێکی دیکە دەرهێنانی بۆ بکات، بەڵام نەیانهێشت، تا ئەو کاتەی دەستم کەشف نەببو، سیناریۆم بۆ فیلم دەنووسی و هەندێکیشیان مۆڵەتیان وەرگرت، بەڵام کە زانرا من سیناریۆکان دەنووسم، ئیدی کشامەوە و لە پشت پەردەوە لە سەر سیناریۆی ئەوانیدی ئیشم دەکرد. بەڵام دواتر کە بارودۆخەکە گۆڕاو باشتر بوو لەگەڵ دەرهێنەر حاتەمی کیا لە سەر (اژانس شیشەای) ئیشم کرد، دوای ئەویش لە فیلمەکانی (سنگهای شیطان و واکنش پنجم ) دا ئیشم کرد.

**تا چەند لەگەڵ ئەو بۆچونەیت کە ئەگەر چیرۆکنووس سیناریۆ بۆ فیلم بنووسێت کاریگەری خراپی لە سەر نووسین و نووسینەکانی خۆی دەبێت؟**

بە نیسبەت منەوە نووسینی سیناریۆ بۆ فیلم، یارمەتیدەرم بووە بۆ ئەوەی لە کورتەچیرۆکەوە بچمە ناو دنیای ڕۆمان و مەشقێکی باشم تیادا کرد لە ڕووی چۆنیەتی دروستکردنی کەسایەتییەوە.

**رات لە سەر فیمینزیم چییە؟**

بزووتنەوەی فیمینیزم بزووتنەوەی لایەنگری مافەکانی ژنانە و هەر جوڵانەوەیەکیش لە پێناو مافەکانی ژناندا هەنگاو بنێت، بڕوام پێیەتی.

**له ئێران گروپی چیرۆکنووسه کۆچبەرەکانت پێکهێناو که چوویتە ئەمریکاش گروپی ئینتەرنێتی کۆچبەرەکان بۆچی؟**

له ئێران له ساڵی ١٩٩٣ەوه وۆرکشۆپەکانی چیرۆکم کردەوه و تا ئەو کاتەی لەوێ مامەوه لانیکەم هەفتەی جارێک بەڕێوەدەچون، له میانەی چالاکییەکاندا گەیشتمە ئەو قەناعەتەی ناوی کۆچبەر له سەر چالاکییەکان دابنێم، چونکه ئێمە له هەمو شوێنێک چیرۆکمان دەخوێندەوه، له ماڵەوه، له پارک، له کۆفی شۆپ، کتێبفرۆشی و ... شوێنێکی تایبەتمان دیاریی نەکردبو و سنوورێکیش بۆ بەشداریکردنی کەسەکان دانەنرابوو، تەنیا ئەوە بوو کە دەبوو یا چیرۆکنووس بوونایە یا خوێنەری چیرۆک بن، لێرەش ئیدی (ئۆن لاین)ی کۆچبەرەکانم کردەوه که تیایدا رەخنە و لێکۆڵینەوەی چیرۆک و ئەزمونی خۆم و ئەوانیدی و خوێنەرانیشی تیادا بڵاودەکرێتەوە.

**هەندێک له رەخنەگران دەڵێن: تۆ له سەر شێوازی ریالیزمی جادویی دەنووسیت تا چەند ئەم بۆچونە بە راست دەزانیت؟**

له چیرۆکی (کەنیزو)ەوه دەردەکەوێت که من به دوو شێواز دەنووسم، هەم له کەشی وەهماوی و جادوییدا، هەم له واقیعەکانی دەورووبەرمدا.

**له ئەزمونەکانتەوه چ شتێک بەو نووسەرانە دەڵێت که تازە دەست به نووسین دەکەن؟**

بخوێننەوه و بخوێننەوه و بخوێننەوه، چونکه خوێندنەوه هەمان نووسینە.

# ستاتیکای ناشیرینی
# دەبارەی ناشیرینی، جوانی و تەکنیک




ن: تیئۆدۆر ئادۆرنۆ

و. لە فارسییەوە: هاوڕێ یووسفی


گەر بڵێین هونەر لەگەڵ چەمکی جوانیدا هاوسەنگ نییە و بۆ دروووستکردنی (رەخساندنی) جوانی، پێویستی بە ناشیرینی- وەک نەفی جوانی- هەیە قسەیەکی تایبەتمان نەکردووە، بەڵام ئەمە نابێتە هۆی ئەوەی کە لە جوانی وەک رێسای قەدەغەکان بڕوانین و بیخەینە پەراوێزەوە. ناشیرینی چیتر پێشێلکردنی رێسا گشتییەکان قەدەغە ناکات، بەڵام ئەو رێسایانەی کە لە ناکۆکیدان بە دڵنیایی ناونشینییەوە بە قەدەغە دەزانێت. گشتگیری جوانی تەنیا دەربڕی خاڵی سەرکەوتوو و باڵادەستی شتە تایبەتەکانە، بەم مانایەی ئەوەی تایبەت نییە، چیتر مافی ژیانی نییە. قەدەغەکردنی ناشیرینی بووەتە قەدەغەکردنی شتێک کە هێشتا فۆرمی و لە هەر روویەکەوە سەرو سامانی نەگرتووە- واتە قەدەغەکردنی ناشیرینی بووەتە قەدەغەکردنی مادەی خاو. ناهاوسەنگی (ناڕێکی) وشەیەکی پسپۆڕانەیە کە دەلالەت لەوە دەکات هونەر توانای وەرگرتنی شتێکی هەیە کە لە دیدگەی جوانیناسی یاخود لێ نەزانەکانەوە (ناپرۆفێشناڵ) ناشیرینە. بە

هەرشێوەیەک، دەبێت جوانی بە بڕگەیەک لە هونەر دابنرێت، یان لانیکەم هەڵگری وەها شتێکی بێت. بۆ نموونە ناوی بەرهەمی یەکێک لە موریدەکانی هێگڵ- ڕۆزێن کلانز- جوانیناسی ناشیرینییە. هونەری کەونینە پاش ئەوە هونەری سوننەتی تەژی و لیوڕێژ، لە نواندنەوانەی کە بابەتەکانیان ناشیرین لە قەڵەمدەدران؛ لە فانووسەکانەوە بگرە تا (بە تایبەت) ئەو سێنێلانەی (selene) خولی گرۆیەتی بۆ یۆنانی کەونینە. لە هونەری مۆدێرندا، گرنگی ئەم هۆکارەی زیادکرد، تا ئەو شوێنەی تایبەتمەندییەکی نوێ لێوەی سەریهەڵدا. بەپێی جوانیناسی سوننەتی، ئەم هۆکارە لەگەڵ ڕێسایەکی فۆرماڵی باڵادەست بەسەر بەرهەمدا، لە ناکۆکیدایە. ئەم ڕێسایە هۆکاری ناوبراو لە خۆیدا جێدەکاتەوە و دەگونجێنێت و بەم شێوە بە پاڵدان و (پشت ئەستووری) دەسەلاتی ئازادی فەردی بەرهەمی هونەری لە بەرانبەر بابەتەکاندا ئەم ڕاستییە دەسەلمێنێت. بەم وەسفەوە، ئەم بابەتانە بە مانای والای قسە و کەلام، جوانن- بۆ نموونە، بە سەرنجدان بە عەمەلکردیان لە کۆمپۆزسیۆنی تابلۆیەکدا- پوختەکردنی هاوسەنگی بزۆزناسیدا- چونکە بەپێی یەکێک لە (وتەزا) ئاشکراکانی هێگڵ، جوانی وەک ئەنجام تەنیا گرێنەدراوە بە هاوسەنگییەوە، بەڵکو لە یەک کاتدا و بەردەوام بەو گرژییەوە وابەستەیە کە لە ئەنجامدا دەستەبەر دەبێت. هاوسەنگییەک کە وەک ئەنجام، گرژییەکەی نەفی دەکات و دەبێتە هۆکارێکی پەرێشانکەر، هەڵە یان بە تەعبیرێکی دیکە دەیکاتە ناهاوسەنگی. لە هونەری مۆدێرندا، لایەنی ناهاوسەنگی ناشیرینی ڕەوشێکی ناڕەزایەتیئاسا دەگرێتە خۆی و مەجالی دەرکەوتنی شتێکدەدات کە لەنێوان ترسناکی ئاناتۆمیکی لە دیدی ڕمبۆ یان بێنەوە، شتێ کە لە ڕووی جەستەییەوە لای بێکێت ناشیرین و ڕقهێنەرە. لە لایەکەوە- هێڵە ناشیرینەکانی زۆربەی ئەو شانۆ هاوچەرخانە و لە لایەکی دیکەوە، ئبتزالی لادێیانەی شێوەکارییە هۆلەندییەکانی سەدەی حەقدەیەمە- هیچ لایەنێکی هاوبەش بوونی نییە. لەوێوە کە چێژی دانان و فەخری هونەر بە ئەستەم لەگەڵ یەکدیدا تێکەڵ دەبن، هەردوویان لە یەکدی دوور دەکەونەوە. لە ناشیرینیدا، یاسای فرمێک لەبەر هۆکاری نەبوونی هەر جۆرە دەسەلاتێک، خۆی بە دەستەوە دەدات. لەم ئاسۆگەوە، ناشیرینی بە تەواوەتی بزۆزەو بە پێچەوانەشەوە، جوانی بە هەمان ڕادە پێویست. نە جوانی و نە ناشیرینی ڕێگە نادەن کە وەک دیکەی پێناسە ستاتیکییەکان، لە چوارچێوەیەکی تایبەتدا دەریان ببڕن؛ جوانیناسییەک کە نۆرمەکانی، تەنانەت بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ بەپێی ئەم پۆلێنبەندییانە ئاراستە دەبنەوە و دەرهەست دەبن. بەپێی ئەم داوەرییەی کە شتێک ناشیرینە- بۆ

نموونە دیمەنێک کە کارگەیەکی پیشەسازی رووخانداویەتی، یاخود سیمایەک کە لە شێوەکارییەکدا خراپ کێشراوەتەوە، دەتوانێت لە خۆیدا وەڵامێک بێت بەم جۆرە دیاردانە، بەڵام رووی خۆی لەو رووناهییەی دەربڕییەتی وەردەگێڕێت. ئەو هەستەی کە ئەنجامی بینینی جیهانی تەکنیکەکان، یاخود بینینی دیمەنی کارگەیەکی پیشەسازی بە رادەی پێویست و بنبڕانە و رازیکەر پاساو روون نەکراوەتەوە؛ بەم هەمووەوە، ئەم هەستە دەتوانێت لە دوایین فۆرمەکانیدا کە بە تەواوەتی بیچمیان گرتووە و بە باوەڕی ئادۆڵف لووس لە رووی ستاتیکەوە بێگەردن، بەردەوام بێت. ئەم هەستە پەیوەندی بە توندوتیژی و رووخاندنەوە هەیە. ئامانجە وەدیهاتووەکان لەگەڵ ئەوەی سروشت لە خۆی پیشانیدەدات نایەنەوە، گەر تەنانەت سروشت ئەم کارە بەپێی شگردە میدیاییەکانەوە بکات.

لە جیهانی تەکنیکەکاندا، توندوتیژییەک کە بەسەر سروشتدا دەسەپێت، لە رێگەی هیچ نواندنەوەیەکەوە ناکرێت رەنگبدەنەوە و بە ئاشکرا لەبەرچاومان دەرکەون. تەنیا لەشێوەیەکدا دەتوانین ئەم دۆخە بگۆڕین کە ئاقاری هێزە تەکنیکییەکانی پانتایی بەرهەمهێنان بگۆڕدرێت و ئەم هێزانە نەک تەنیا بە ئاراستەی ئامانجە بەر مەبەستەکان هەنگاو بنێن، بەڵکو لەگەڵ سروشتیش- کە ئەویش لێرەدا فۆرمێکی تەکنیکی گرتووەتە خۆی- هاوخەت بن. هەڵچوونی هێزە بەرهەمهێنەرەکان دەتوانێت پاش وەلانانی کەموکوڕییەکان، جگە لە رەهەندی بەرزبوونەوەی چەندی بەرهەمهێنان لە رەهەندێکی دیکەدا هەنگاو بنێت. سەرەتاکانی وەها بابەتێک دەتوانین لەوێدا ببینین کە بیناکارە بەردییەکان لەگەڵ فۆرمەکان و هێڵەکانی دیمەندا دێنەوە، هەڵبەت کاتێک پێداویستییە سەرەتاییەکانی بینایەک لە هەمان شوێندا هێنرابێتنە دەرەوە، لێرەو بەم پێیە دەبێتە پاژێک لەو شوێنە- وەک ئەوەی لە زۆربەی کۆشکەکاندا دەیبینین. ئەو شتەی پێی دەڵێن دیمەنی کولتووری کاتێک جوانە کە ملکەچی وەها سەر نموونەیەک بێت. عەقڵانییەتێک کە لەم بنەما ئاسایانە کەڵک وەردەگرێت، یارمەتیمان دەدات لە چاکبوونەوەی برینەکانی عەقڵانییەتی رووت. تەنانەت ئەو مەحکوومییە گەوجانەی کە لەسەر ئەو بنچینەیە زەینییەتی بۆرژوا ئەو ئاسۆگەی کە پیشەسازی رووخانداویەتی بە ناشیرین دەزانێت و گەوجانە مەحکومی دەکات، دەتوانێت بەرەو درووستکردنی پەیوەندییەک بڕوات، کە تیایدا هۆکاری سەرەکی هەمان باڵادەستی ئاشکرای سروشتە، هەڵبەت ئەو شوێنەی سیمایەکی سەرکەوتوو لە خۆی نیشانی مرۆڤەکان دەدات. لەبەر ئەم هۆکارە، هەڵوێستگرتنی بارگاوی بە تووڕیی بۆرژواکانەوە پاژ/ بەشێکە لە ئایدیۆلۆژیای

بالادەستی ئەژماردەكرێت. گەر پەیوەندی مرۆڤەكان لەگەڵ سروشتدا خەسڵەتە سەركوتگەرانەكەی لە كیس بدات- كە گەڵبەت درێژەی زوڵمكردنی مرۆڤە لە سروشت و نەک بە پێچەوانەوە- وا ناشیرینییەک بزر دەبێت.

لە جیهانێكدا كە تەكنیک كاولی كردووە، لەناوبردنی ناشیرینی لەو تەكنیكەدایە كە فۆرمێكی ئاشتیخوازانەی هەیە، نەک لەو بەستێنانەدا كە پێشوەخت دیاریكراون. ئەو شتەی زۆر بە هاسانی ناوی دەنێین ناشیرین، دەتوانێت لە رێگەی بەهایەكەوە كە لە دڵی بەرهەمێكدا دەدۆزرێتەوە لایەنی سەروبن گرتنی خۆ بدۆرێنێت و ناشیرینی خۆی (لە خۆی) دوورخاتەوە. شتێک كە بە ناشیرین دادەنرێت- شتێک كە لەلایەن هونەر لە هەنگاونانی بەرەو سەربەخۆییدا وەلابخرێت- لە هەنگاوی یەكەمدا شتێكە كە لە رووی مێژووییەوە كۆن بووەو لێرەوە، هەمان ئەو شتەیە كە بۆ خۆی میدیایی دەبێتەوە. چەمكی ناشیرینی دەیتوانێ لە هەموو چاخەكان لە بچڕانێكدا دەركەوێت كە هونەری لە قۆناغە كەونینەكەی جیادەكاتەوە. ئەم بابەتە دەتوانێت وەک گەڕاندنەوەی بەردەوامی بچڕان تەعبیر بكرێت، بچڕانێک كە پاژێک لە دیالێكتیكی تیشكۆكانە و هونەر تێیدا بەشدارە. ناشیرینی كەونینەو دەمامكە ئاینییەكان كە وەک مرۆڤخۆرەكان لایەنێكی ترسناكیان هەبوو بابەتێكی بنەڕەتی ئەژمار دەكران و ئەو ترسە كە لە دەوروبەری خۆیاندا وەک كەفارە بڵاو دەكردەوە، تەقلید (لاسایی) دەكرد. بەلاوازكردنی ترسە ئوستوورەییەكان، كە بەرهەمی هوشیاری تاكەكان بوو، ئەم خەسڵەتانە گوازرانەوە بۆ قەدەغەكان- ئەو خەسڵەتانەی پێش ئەمە دەیانبەخشی بە پێكهاتی تیۆری و فەلسەفی ئەم قەدەغەكراوانە دەبەخشی. كاتێک ئەم تایبەتمەندییانەی ناشیرین دەبن لە بەرانبەر (چەمكی) ئاشتیدا قەرار بگرن، ئاشتییەک كە بەرهەمی فۆرمگرتنی تاک و ئازادییە نوێكەیەتی، بەڵام ئەم داوەڵە پیرانە، لە مێژوودا درێژە بە ژیان دەدەن. مێژوو پابەند نییە بە بەڵێنی ئازادی بەخشینی تاک و تیایدا، تاک وەک هۆكاری كۆیلەیی درێژە بە جادووی ئوستوورەیی فۆرمێک دەدات، كە لە یەک كاتدا هەم دژی هەڵدەگەڕێتەوە و هەم كۆیلەشیەتی.

ئەو ئەزموونەی كە نیچە لەسەری دەدوێت، لە هونەردا شایستەییەكانی جیسمانیان وەرگرتووە. بەپێی تیۆری نیچە، كۆی شتە باشەكان رۆژێک ناشیرین بوون. دیدگای شیلینگیش دەربارەی ترسە بەدەوییەكان لە هونەردا رەنگی داوەتەوە. ناوەرۆكی بەتاڵكرا و چاككراوە لە خەیاڵ و فۆرمدا، لایەنێكی والای وەرگرتووە. جوانی، دەستپێكێكی بێگەرد لە چەمكە ئەفلاتوونییەكەیدا نییەو تەنیا ئەو كاتەی بێچم وەردەگرێت كە بابەتی ترسی كەونینە وەلابنرێت

و له ڕێگەی ئەم وەلانانەوە، بە ناشیرین دەزانرێت. بە وتەیەکی دیکە، جوانی کاتێک دیار دەکەوێت، کە لایەنی وەرچەرخانی ڕوولەدوا بگرێتە خۆی. جادووی تەلیسمکراوەو ئەم تەلیسمە دەگوازرێتەوە بۆ جوانی. چەند چەمکبوونی ناشیرینی دەگەڕێتەوە بۆ ئەمەی کە تاک ئەوەی لە هونەردا مەحکوم دەکرێت بە پاژێک لە چەمکی دەرهەست و پێکهاتی ناشیرینی بزانێت- شتێک وەک جنسییەتی چەند فۆرمی، ناشیرینبوون و مەرگێک کە بە توندوتیژییەوە بسەپێنرێت. ئەوەی دووپات دەبێتەوە بەرهەمهێنەری شتێکە کە بە "ئەویدی" دەزانرێت و دژیەتی و بەبێ ئەوە، چەمکی هونەر ناتوانێت بوونی هەبێت. ئەم "ئەویدیە" کە لە ڕێگەی نەفییەوە دەرهەست دەبێت، لایەنی باوەڕناسای هونەری مینۆکیخوازانە لە ڕێگەی ڕاستکردنەوەیەوە دەساوێت. لە بنەڕەتدا "ئەویدی" دژی هەمان ئەو جوانییەیە کە خۆی لەگەڵی ناکۆک بوو.

دیالێکتیکی ناشیرینی، لە مێژووی هونەردا، جوانیش دەگرێتەوە. لەم ئاسۆگەوە، (هونەری) کیچ جوانی ئەو شتەیە کە ناشرینە. بەم واتایە کە کیچ، لەژێر ناوی هەمان ئەو شتەدا کە پێش ئێستا جوان و هەنووکە بزرێتی دژەکەی ئینکاری دەکات، بە قەدەغە دەزانرێت، بەڵام ئەمەی کە ناتوانرێت تەواوتر چەمکی دەربڕین- ڕێک وەک لایەنە پۆزیتیڤەکەی- بەجۆرێکی بنەڕەتی پابەندە بە پرۆسەی ناونشینی هونەرەوە، چونکە هەرچەندە هونەر بەشێوەیەکی تەواتر لە بندەستی تاکێتیدا بێت و هەرچەندە تاکایەتی زێدەرتر ناچار بێت بەوەی پێشتر نەزم دراوە ئاشتی نەگر بێت و بە هەمان ڕادە هۆکاری تاک یاخود شاکلە دەبێتە سەر نموونەی جوانیناسی. ئەم بنەمای شاکلەیە لە ڕێگەی ملکەچکردنی یاسا تاکییەکان و سەرنجنەدانی ئەویدی، بەبێ ئەوەی هەر جۆرە ئەویدییەک بیلەرزێنێت و سستی بکات، خەسڵەتی ڕەزامەندی خۆی دەپارێزێت. بەم واتایە کە تاکایەتی، بێئاگا لە بوونی خۆی، چێژ لە هەستی سوڵتە و باڵادەستی خۆی دەبات. ستاتیکای چێژوەرگرتن کاتێک لە ماکێتی قەبەی خۆی جیا دەبێتەوە، لەگەڵ پەیوەندی ماتماتیکی لەناو چەشتدا بەیەکدا دەچن. بەناوبانگترین نموونەکەی لە هونەرە جیسمانییەکاندا "بەشی ئاڵتوونییە"، کە دەتوانین بەرامبەرەکەی لە پەیوەندییە هارمۆنیکە سادەکانی هاوئاهەنگی مۆسیقاییەکاندا ببینین.

ناوی ناکۆکی "دۆن ژوان" لە بەرهەمەکەی ماکس فریشدا عەشق بە هێندسە (١٩٥٣) لەبارە بۆ هەر جۆرە جوانیناسی چێژبردن. لە چەمکی جوانی و ناشیرینی، دەبێت هونەر بەهای ئەو پێکهاتەگەراییە بدات کە جوانیناسی کانت پڕوپاگاندەی بۆ دەکات. پێکهاتەی هونەر ناتوانێت لە بەرانبەر ئەم پێکهاتەگەراییەدا بەرگری

لە خۆی بکات، چونکە هونەر تەنیا لەبەر ئەمە لە بەرانبەر بالادەستی هێزە سروشتییەکاندا دەوستێتەوە، کە بتوانێت لە فۆرمی بالادەستی بە سروشت و مرۆڤەکاندا بەردەوام بکات. فۆرمگەرایی کلاسیسزم هەڵەیەکی گەورە دەکات و رێک هەمان ئەو جوانییەی کە بە گەورە دەزانێت، دەسڕێتەوە. ئەم لە رێگەی توندوتیژییەوە لە سامانبەخشین و لە تەنیشت یەکداناندا هەروەها لە رێگەی هەموو ئەو شتانەوە نابزر لە نموونەی هونەری کلاسیک دەچن، بەرێوە دەچێت. کۆی ئەو شتانەی لایەنی داسەپاندن و زیادەیان هەیە لە کۆی کۆمەڵە بەرهەمی هونەریدا، ئەو هاوئاهەنگییەی هونەری کلاسیک بیۆ دەگەڕێت، نەفی دەکات؛ بەم شێوەیە زۆرەملێ، سەپێندراو لایەنێکی هەلاوێردئاسا لەخۆ دەگرێت. گەرچی پێویست نییە تاکو خەتی بەتاڵ بەسەر خەسڵەتی پێکهاتەیی ناشیرینی و جوانی لە رێگەی جوانیناسی ناوەڕۆک بکێشین، ناوەرۆکەکەی هەڵگری دەربڕین و پێناسەیە. ئەم ناوەرۆکە هەمان ئەو کێشە دەبەخشێتە بەرهەمی هونەری کە رێگە نادات بتوانین دەهەستی ناوەکەی لەگەڵ ماکێتی زیادەو بەد فۆرمدا نەرم بکەینەوە. ئاشتی وەک توندوتیژی، فۆرمگەرایی و جوانیناسەکی و هەروەها ژیانی ئاشی نەگر کۆمەڵێکی سێ جۆر- سیانە پێکدەهێنن.

**سەچاوە:**

زیباشناخت، شمارە (۱۷).

ژێدەر: ئەم وتارە وەرگێڕانی بەشی سێیەمی کتێبی تیۆری جوانیناسی بەرهەمی تیۆدۆر ئادۆرنۆیە.



# نامەی سالنجەر بۆ هێمنگوای

نووسینی پێشەکی و وەرگێڕانی نامەکە لە ئینگلیزییەوە

● ژووان جەلال

کۆتایی هاوینی پاش جەنگی دووەمی جیهانی بوو، نووسەرێکی گەنجی بیستوپێنج ساڵ، ماندوو لە جەنگ، لە نەخۆشخانەی نۆرنبێرگەوە، پەیوەندی بە نووسەرێکی ترەوە کرد لە پاریس، کە ئەویش کارەکانی بەرجەستەکردنی فەزای جەنگ بوون.

«ئەو قسانەی لێرە لەگەڵ تۆدا کردمن، تەنیا ساتەکانی باشیم بوون»، سالنجەر لە کۆتایی نامەکەیدا بوو بۆ هێمنگوای، ئەو نامەیەی، بۆ یەکەمین جار، لە کتێبخانەی بۆستنی جۆن ئێف کەنەدی، لە ٢٨ی مارچی ٢٠١٠دا خرایە پێشچاو، دوای ئەوەی ماوەی سی ساڵ لە هەمان کتێبخانەدا پارێزرابوو.

ئەوکاتەی هێمنگوای رۆماننووسێکی دیار و بەناوی ئەمریکایی بوو، لە ریتز هۆتێل لە پاریس بۆ یەکەم و دوایەمین جار، لەگەڵ سالنجەر یەکتر دەبینن، لەوێ چەند سەعات دەمەتەقێ دەکەن و دواتر پەیوەندییان بەردەوام دەبێت.

سالنجەر بە ناوی پاپەی ئازیزەوە دەنووسێت، کە نازناوی هێمنگوایە، بە جێری سالنجەریش ئیمزای دەکات کە ناوی تەواوی خۆی جێرەم دەیڤدە، ئەوەی نیشانەیەکی هاوڕێیەتیی زۆر نزیکی نێوانیانە.

نامەکە هەر لە دەسپێکەوە بە شێوە قسەکردنە خۆشەکەی سالنجەر خۆی دەست پێدەکات، ناوی کاترن بارکلی دێنێت، لە رۆمانی «ماڵاوا لە چەک»ی هێمنگوایەوە، دواتر هەستی خزمەتی سەربازیی، کە دەنووسێت لە هەموو جەنگەکەدا تەنیا ساتی باشیی خۆی، نووسینی ئەم نامەیەیە، هەر ئەوەی جەنگ کاریگەرییەکی

وەها لەسەر ژیانی نووسەر جێ دەهێڵێت، پاش ساڵان بە کچەکەی دەڵێت «هەرگیز بۆنی سووتانی جەستە لە لووت دەرناچێت، هەرچەند بژیت». سەرەوەختی بەر لە نووسینی پاسەوانێک لە مەزرا لە ١٩٥١دا دەبینرێت، لەوێدا نووسەر بە جۆرێک لە لاقرتێوە خۆی بە قارەمانی رۆمانەکە؛ هۆڵدن کۆڵفیلد دەچوێنێت، کە لە هەندێ کورتە چیرۆکی پێشووتریشیدا دەرکەوتووە.

سالنجەر لە نامەکەیدا دەڵێت؛ هیچی نییە، جگە لە خەمگینییەکی بەردەوام، مەبەستەکەشی لەو نامە نووسینە قسەکردنە بۆ کەسێکی عاقڵ. باس لەوە دەکات پزیشکەکان پرسیاریان دەربارەی ژیانی سێکسی و منداڵیی و بوونی لە سوپادا لێکردووە، کە پێدەچێت بە مەبەستی دۆزینەوەی سەرچاوەی خەمۆکییەکەی بووبێت.

هەروەها، دەربارەی رۆمانەکەی لە هێمنگوای دەپرسێت و داوای لێ دەکات نەیفرۆشێت بە سینەماکان، دواتر باسی هەندێک لە کارەکانی خۆی دەکات؛ نووسینی دوو چیرۆکی تر و چەند دانە شیعرێک و بەشێک لە شانۆنامەیەک، دواتر پشکۆیی نووسینی پاسەوانێک لە مەزرا بەوەی رۆمانێکی زۆر هەستیاری لە خەیاڵدایە، خۆزگە دەخوازێت لە سوپا دەرچێت و خۆی بۆ تەرخان بکات، نیگەرانی ئەوەیە حاڵەتی دەروونی دواجار ببێتە هۆی بە خوێڕی ناولێنانی و ئەم مۆرە کاری وەک نووسەر تێکوپێک بدات.

سالنجەری نووسەری یەک لە رۆمانە بەناوبانگەکانی هەموو سەردەمەکان 'پاسەوانێک لە مەرزرا' ٢٧/ جانوەری/ ٢٠١٠، لە ٩١ ساڵیدا لە ماڵەکەی خۆی لە نیوهامشا کۆچی دوایی کرد.

پاش مردنی هێمنگوای، هیچ وەڵامنامەیەک نەکەوتووەتە بەردەست، نازانرێت ئەگەر وەڵامی سالنجەری دابێتەوە، بەڵام لە کتێبخانەکەیدا «پاسەوانێک لە مەزرا» دۆزراوەتەوە.

ماری خانمی هاوسەری هێمنگوای نامەکەی خەڵاتی کتێبخانەی بۆستن کردووە، وەک پێزانینێک، بۆ هاوکاریکردنی، تا سەفەر بۆ کوبا بکات، دوای مردنی مێردەکەی لە ١٩٦١دا.

**نامەکە:**

**پاپەی ئازیز!**

من لە نەخۆشخانەی گشتیی نۆرنبێرگـەوە بۆت دەنووسم. هەر ئەوەندە هەیە، کە بڵێم، کاترن باکلی بەجارێ جێی خاڵییە. چاوەڕێم سبەینێ، یان دووسبەی دەربچم. هیچم نییە، ئەوەنەبێت لە حاڵەتێکی ئاوا بەردەوامی خەمگینیدام، گوتم وا

باشە قسە بۆ کەسێکی عاقڵ بکەم. لە بارەی ژیانی سێکسیمەوە پرسیاریان لێکردم (کە لەوە ئاساییتر نابێت. ئەی هاوار!) هەروەها لە بارەی منداڵیمەوە (ئاساییە. تا تەمەنی بیستوچوارساڵی دایکم دەیبردم بۆ قوتابخانە، بەس ئیتر خۆت دەزانی شەقامەکانی نیویۆرک چۆنن). دواجاریش لەبارەی هەستی بوونم لە سوپادا لێیان پرسیم؛ هەمیشە حەزم بە سوپا بووە.

لێستەر هێمنگوایم بینی، بەر لە گەڕانەوەی فەیلەقی چوار بۆ ئەمریکا، بە ئۆتۆمبێلەکەی هات بۆ ماڵمان، لە وێسنبێرگ، شتێکی خواردەوە و قسەمان کرد. کەسێکی باشە.

لە بەشەکەی ئێمەدا چەند کەسێکی زۆر کەم ماون بگیرێن. ئێستا ئەو منداڵانە هەڵدەگرین، کە تەمەنیان لە خوار دەساڵانەوەیە و رق و دڵڕەشییەکیان تێدایە. دەبێت فۆرمی گرتنی ئەو چکۆلانە بگەیەنمە سوپا و راپۆرتێکی تێروتەسەلیان بدەمێ.

کاپتن ئۆلی ئاپڵتن، فەرماندەی پێشووی مەفرەزە، بەهۆی خاچی سوورەوە لە سوپا دەرچوو و بە بەر نەرمەبارانی ئەستێرەی برۆنزەوە، گەڕایەوە بۆ ئەمریکا. بەرلەوەی بڕوا، بە خاتری رۆژانی کۆن، وێنەکانی خانووەکەی، لە سکارسدەیڵ، دەستاودەست پێدایین. ساتێکی کاریگەر و نەفرەتیی بوو بۆ زۆربەمان.

رۆمانەکەت چۆن دێ بەدەستەوە؟ ئومێدم هەیە باش کاری تێدا بکەیت. نەیفرۆشی بە سینەماکان. تۆ کابرایەکی دەوڵەمەندیت. وەک سەرۆکی زۆربەی یانەی هەوادارانت، دەزانم لەبری هەموویانە، کاتێک دەڵێم، بڕوخێ لەگەڵ گاری کوپەر. هەر بەڕاست کار لە رۆمانێکی تازەدا دەکەیت، وا نییە؟ لەوە تێدەگەم ئۆتۆمبێلەکانی کوبا سەلامەت نین.

داوام لە سی ئای سی کرد بمنێرن بۆ ڤییەنا، بەڵام تا ئێستا هیچ دیار نییە. لە ساڵی ۱۹۳۷دا نزیکەی ساڵێک لەوێ بووم و دەمەوێ جارێکی تریش ئایسکەیت بکەمە پێی کچانی ڤییەنایی. ئەوە داواکارییەکی قورس نییە لە سوپا بکرێت.

دوو دانە لە چیرۆکە تاوانکارییەکانمم (و.ک. نووستن لەگەڵ مەحرەم) نووسیوون، چەند شیعرێکیش، لەگەڵ بەشێکی شانۆنامەیەکدا. ئەگەر رۆژێک لە رۆژان لە سوپا دەربچم، رەنگە شانۆنامەکە تەواو بکەم و داوەتی مارگرێت ئۆبراین بکەم تێیدا رۆڵم لەگەڵدا بگێڕێت. بە قژێکی کورت و چاڵێکی روومەتی ماکس فاکتەری بە ناوەڕاستەوە، دەتوانم خۆیشم رۆڵی هۆڵدن کۆڵفیلد ببینم. جارێکیان رۆڵێکی زۆر هەستیارم بینی، وەک رالی لە "کۆتایی سەفەر"دا؛ زۆر هەستیار.

قۆڵی راستم دەبەخشم بەس لە سوپا دەرچم، بەڵام لەسەر ئەو بلیتە هەتاهەتاییەی پزیشکی دەروونی نا: ئەم-پیاوە-بە کەڵکی-سوپا-نایەت. رۆمانێکی زۆر هەستیارم لە خەیاڵدایە، نامەوێت بە نووسەرەکەی بڵێن خوێری لە ۱۹۵۰دا. من خوێریم، بەس خەڵکانی خەراپ نابێت ئەوە بزانن.

ئێە! ئەگەر توانیت، بەهیوام بۆم بنووسیت. لە مەیدان نەبیت، زۆر ئاسانتر دەتوانیت بە روونی بیر بکەیتەوە، مەبەستم بۆ کارەکەت.
هیوادارم جاری داهاتوو، کە دێی بۆ نیویۆرک، لەوێ بم و ئەگەر کاتت هەبوو، بتبینم. لە هەموو شتەکاندا، ئەو قسانەی لێرە لەگەڵ تۆدا کردمن، تاقە ساتەکانی باشییم بوون لە هەموو شتەکە.

**دڵسۆزانە**
**جێری سالنجەر**

پس؛ ئەگەر هەرشتێ هەیە بتوانم لێرە بۆت بکەم، هەر پەیامێکت هەبێت بۆ هەرکەسێک، زۆر خۆشحاڵ دەبم.
پرۆژەکتێبی چیرۆکەکانم هەرەسی هێنا، کە بەڕاستی شتێکی زۆر باشە و پێی تێک نەچووم. من هێشتا بە درۆودەلەسە و هەست و سۆزەوە بەستراومەتەوە، هەروەها بینینی ناوی خۆم، لەسەر بەرگی کتێبێک، هەر باشتربوونێک بۆ چەندساڵی تر دوا دەخات.
ئێدمند ولسن ئاوا وردەواڵەکتێبێکی بۆ ئێف سکۆت فیتزجیرڵد چاپ کردووە (بیرۆکەیەکی بەدە) ناوی ناوە رووخان. مالکم کاولی، لە نیویۆرکەردا، هەڵسەنگاندنێکی بۆ کردووە، یان بڵێین هەڵسەنگاندنی بۆ فیتزجێرلد کردووە بەو شێوازە نایابە مەلعونەی، کە رەخنەگران هەڵسەنگاندن بۆ کابرایەکی مردوو دەکەن. زۆر ئاسانە لێکۆڵینەوەیەکی "باش" لە بارەی فیتزجێرڵدەوە بنووسی. کورتهێنانەکانی جوان دەردەپەڕنە دەرەوە، ئەگەر هەشبن و دەرنەکەون، فیتزجێرڵد خۆی ئاماژەیان پێ دەدا. شین و گریان بۆ گەشەنەکردنی فتزجێرڵد زۆر کەرانە، یان رەخنەگرانە دێتە پێش چاو. زۆر ئاشکرا دیارە، کە هەرکەسێ کتێبێکی وەک گاتسبی بنووسێت، هەرگیز رێی تێناچێت بتوانێت "گەشە بکا". وەستاییەکەی، یان جوانییەکەی، تەنیا لە لاوازییەکەیدایە. پێتوانییە؟ بڕوا ناکەم، وەک رەخنەگران دەڵێن، "دوایەمین دەسەڵاتدار" باشترینی کارەکانی بێت. لەوەدابوو تێکی بدات، خەریکبوو تێکهەڵکێشێکی گاتسبییانەی تێبخا. ئەوەی باش بوو تەواوی نەکرد؛ وابزانم.
**بە هیوای باشترین بۆ تۆ**
**جەی.**

**سەرچاوە:**
http://www.huffingtonpost.com/201208/08//salinger-hemingway-letter_n_1756459.html

# چەند شیعرێکی هەڵبژاردە

و. لە فارسییەوە: کاوە گوڵکار

## دڵم بە بۆنی تۆ ئاوێتەیە

م.ش.لنگرودی



دڵم ئاوێتەی بۆنی تۆیە و
لەگەڵ هەموو سپێدەیەک
پۆلێک وشەی سەرلێشێواوی خەواڵوو
هەڵدەستن و
بە شوێن زاریاندا، ئەگەڕێن.
تاکو لە تۆی ئازیز بدوێن
بۆ کوێی ئەم جیهانە رۆشتی
شوێن پێت وەکو چنگێ
دانەوێڵەی رۆکراوە
بەهەر چوار لادا رژاوە
بۆ باڵندە.
...
دەڕۆیت و ناگەڕێیتەوە و
من دڵنیام
شیعر پاش تۆ
لە چاوەڕوانی بەردەوام
لە رۆژێکی ساردی زستان
بەدەم تۆف و رەهێڵەوە
دەبێتە پارچەیەک سەهۆڵ
لەسەر گوێسبان.

٢٠١١/٦/١٢ بەیادی سەفەری ژەنەراڵی پاییز بۆ سوید

# سەردەمی منداڵی

ئیسماعیل خویی

ئەو کاتەی کە من منداڵ بووم
هەڵفڕینی کۆلارەیەک
لەبانی پێڵوی چاوتەوە دەمەوبەیان
ئەیبردی تا
نارنجستانی هەتاو.
ئاخ
ئەو مەودایە چەندە کورت بوو!

***

ئەوکاتەی کە من منداڵ بووم
چاکی ژنێک بوو
بۆنی جگەرەی لێدەهات و
فرمێسکەکەی وەکو رووبار
بە چاویلکەی زەڕبینیا
ئەهاتە خوار و
لەتەک دەنگی قورئانەکەی
تێک دەئالآن.

***

ئەوکاتەی کە من منداڵ بووم
ئاو و زەوی و هەوا زۆر بوون
سیسرکەکان
بەدرێژیی شەو
لە بێدەنگی کڕو کپی بەرتریفە
گۆرانییان ئەچڕیەوە

***

ئەوکاتەی کە من منداڵ بووم
چێژو هێڵێ بوو
لە بەردەوە تا قروسکەی



سەگێکی پیری دەردەدار
ئاخ بۆ پەنجەی
بێ تاوانی تاوانبارم
***
ئەوکاتەی کە من منداڵ بووم
دەکرا کەنارییەکی کفت و بێ هێز ببینی
کە پەڕوپۆی لەژێر دەمی مقەستێکا
هەڵ ئەوەری و
با ئەیبردن
دەکرا... دەکرا تێر سەیریکەی
پاشان
بە سەربەرزی و بێ رەحمانە
پێی پێ بکەنی.
***
ئەوکاتەی کە من منداڵ بووم
لە هەر هەزار و یەک شەودا
بەس چیرۆکێک
دەیتوانی خەوت بزڕێنێ
یان
چاوەکانت پڕبکا لە خەوێکی خۆش.
***
ئەوکاتەی کە من منداڵ بووم
سروشت لە ئێستا
بەهێزتر بوو
***
ئەوکاتەی کە من منداڵ بوو
لەسەر پەنجەرەی پێکەنین
ریشۆڵەی شادی دەستەمۆ
هێلانەیان چێ دەکرد
ئاخ!
ئەو رۆژانە پشیلەی بیرکردنەوە



هێند زۆر نەبوون.
ئەو دەمەی کە من منداڵ بووم
خەڵک نەبوون
ئەوکاتەی کە من منداڵ بووم
خەڵک نەبوون
ئەوکاتەی کە من منداڵ بووم
خەم بوو
بەڵام
یەکجار کەم بوو.

تاران
٧٨/٥/٢٠



## ڕووباری کات

**مهدی اخوان ثالث**

پڕاوپڕ
لە پووچی، لە هیچ
ڕووباری کات
ئەخشێ و ئەڕوا
بێدەنگ و مات

***

وەک چۆن گۆزەی لە کڵ دەرچووی
جگەرسووتاو
لە خەویدا ئاو دەبینێ و
لەناو ئاودا
زیخ و چەوی دێتە بەرچاو
منیش ئاوا،
دۆست و دوژمنم ئەناسم

ئەز دەزانم
ژین شیرینە و لەبەر دڵان
مردن تاڵەو ئێسک گران.
بەڵام ئەفسووس!
نازانم نا... نازانم... نا
بەکێ بڵێم منی هەژار
کە هەندێ جار
پەنا دەبەم بۆ لای نەیار
لە دەستی یار
***
رووباری کات
ئەخشێ و ئەڕوا
بێدەنگ و مات



## هەڵاتنی هەور

نصرت رحمانی

دەشێ بەردێ
ئەیهۆنییەوە کەزیەی رووبار
هەتاو، زریوەی گزنگی
بۆ کراسی پڕ لە چینی ئاوی سەرخۆش
ئەی کردە خوار
پەڵە هەورێکی بچکۆلە
دوورکەوتەوە لە گەواڵەی هەوری رەش و
رۆیی بە غار.
***
دەشێ بەردێک
ئەیهۆنییەوە کەزیەی رووبار
هەتاو زریوەی گزنگی

بۆ کراسی پڕ لە چینی ئاوی سەرخۆش
ئەکردە خوار
پەڵە هەورێکی بچکۆلە
دوورکەوتەوە لە گەواڵەی هەوری ڕەش و
ڕۆیی بە غار
گرتی سووچێکی ئاسمان
دوایی هێنا بە گشت قسان
بە ئەفسانەی مان و نەمان

## هەڵفڕین

**فروغی فروغزاد (بەدەستکارییەوە)**

لەسەر تەرمی کەنارییەک
بە خوێن نووسرابوو ئەم پەندە
هەڵفڕین قەت لەبیر مەکەن
تەمەنی کورتە باڵندە



**سەرچاوە:**

روشن تراز خاموشی

برگزیده شعر امروز ایران

چاپ: ۱۳۵۷

مرتضی کافی- انتشارات اگاه

# لێرە جادەکان بێ کۆتایین



**ئامادەکردنی: شەریف فەلاح**

**بەرایی**

تەوفیق ئەمانی، لەدایکبووی مەریوانە، شارێکی گەشتیاری و زۆر جوان و دڵرفێن، شارێک لە پەنا گۆلی "زرێبار" کە سیمایەکی جوانی بەو شارە بەخشیوە و گۆلێکی تەژی لە خەم و پەژارە و پشتگوێ خران و کەمتەرخەمی. ئەم لاوە هونەرمەندە جلوبەرگی سپۆرت دەپۆشێت و ئۆگری رەنگی کێرێمی و رەشە. زۆر حەزی لێبووە بڕواتە زانکۆ، بەڵام تەنیا بڕوانامەی دیپلۆمی وەرگرتووە.

قاسپەی کەو لەلای پڕە لە نوستالۆژیا و هەمووکات لەبەر خۆیەوە ویرەویر گۆرانی دەڵێت و "بژیت" وشەی دووپاتەی سەرزاریەتی. گۆڤاری فیلم و بەرهەمەکانی "پاولۆ کۆیلۆ" دەخوێنێتەوە و زۆری حەز لە دۆڵمەیە و بێزی لە "کفتە و شۆروا" دەبێتەوە!

هەنار زۆر دەخوات و خاوەنی لەش و لارێکی سالمە، هێور و لەسەرەخۆ و کەم قسەیە و هەمیشە لەناو خۆیدایە و هەوڵدەدات بە پارێزە و بە رێکوپێکی قسە بکات. زۆرتر گوێ لە مۆسیقای کلاسیکی کوردی و "پاپی ئیسپانیۆلی" دەگرێت و لەناو ئامێرەکانیشدا حەزی لە پیانۆیە.

"تەوفیق" عاشقی کەش و هەوای سامالْ و شەیدای بۆنی رەیحان و خاکی ئاوپرژێن کراوە.

ترسی لە پیرییە و وای بە باش دەزانێت بە جۆرێک بمرێت کە بە هیچ لەونێک نەبێتە هۆی ئازار و ئەشکەنجەی دەورووبەرەکانی.

لەناو دونیای جەنجالْ و پڕ لە هەرا و هوریا پڕ لە تەنگژە و مەینەتیدا بۆ دەربڕینی خەم و بڕک و ئازارەکانی خۆی و کۆمەلْگاکەی، هونەری حەوتم "سینەما"ی بۆ خزمەت بە ژیان هەلْبژاردووە و لە چاوی کامیراوە دەڕوانێتە ژیان و کۆمەلْێک خەون و خولیا و روانگەی تایبەت و سەردەمیانەی هەیە و لەناو کۆڕ و کۆمەلْەی سینەماکارانی لاوی کوردستانی رۆژهەلاتدا کەسێکی دیار و بەرچاوە و بەردەوامە لە کار و داهێنانی هونەری.

## خولقێنەری "ئێرە جادەکان بێ کۆتایین" کێیە؟

تەوفیق ئەمانی، لەدایک بووی سالْی ١٩٨١ی شاری مەریوانە لە رۆژهەلاتی کوردستان و دەرچووی سالْی ٢٠٠٣یە لە بواری سینەمادا لە ئەنجومەنی سینەمای لاوانی ئێران و هەمان سالْ بە شێوەیەکی جیدی و ئەکادیمی لە بواری نووسینی سیناریۆ، دەرهێنانی فیلم و بەتایبەت کورتەفیلم و وێنەگریدا چالاکییەکانی دەستپێکردووە.

تێڕوانینی تەوفیق ئەمانی بۆ سینەما و بەتایبەت "کورتە فیلم" تێڕوانین و گۆشە نیگایەکی جیاوازە و وەک خۆی دەلْێ "من بۆ ئەم کارە هونەرییە فایل و دۆسیەیەکی تایبەتم تەرخانکردووە کە ئەویش هەلْقولْینی باوەڕێکی دەروونیی و پابەندبوون بە پرسێکە کە تاکی بەرهەمهێنەری کورتەفیلم (هەلْبەت کەسێکی سەربەخۆ لە کاتێکی دیاریکراو و کورت خایەندا دەریدەبڕێت". پێداگریدەکات کە کورتەفیلم، بەرەنجامی پەرۆشی و کەلْکەلْەی دەرونیی و لەڕاسیتدا چیرۆکی دلْی دەرهێنەرێکە کە ئەم پرسە بۆ تەوفیق ئەمانی لەسەرووی هەموو شتەوەیە و راستگۆیانە دەلْێ ئەزموونی کورتەفیلم لەلای من، چەشنی تاقیککردنەوەی خودە، بۆ چوونە ناو مەیدانێکی بەرینتر و کاری جیدیی دیکە.

## تێڕوانینی تەوفیق ئەمانی بۆ کورتەفیلم

وەک زۆر دەرهێنەری دیکەی بواری سینەما دەست نابات بۆ دەستەواژە و چەمکی پڕ لە گرێ و گۆلْ و فەلسەفییانە، بەلْکوو زۆر سادە و ساکار دەلْێ: "کۆمەلْە وێنەیەک کە چنینیان بەدوای یەک و لە ماوەیەکی دیاریکراو و کەمدا

بتوانێ سەرنجی بینەر و بەردەنگ بۆ لای خۆی رابکێشێت، کورتە فیلمە". بەڵام روانگەیەکی دیکەش لە گۆڕێ دایە کە پێی وایە کە کورتە فیلمێک کە هەڵگری بابەت و ناوەرۆکێکی بەهێزترە، یان بە واتایەکی تر هەر فیلمێک کە تەنیا هەڵگری تاقە توخمی "ماوەی کورت" بێت، کورتە فیلم نییە!

ئەم دەرهێنەرە لاوە رۆژهەڵاتییە دەڵێ، ئێستا لەوانەیە زۆر کەس لە روانگەیەکی دەمارگرژانەوە بڕواننە ئەم بابەتە، بەڵام لەڕاستیدا ناکرێ فیلمێک کە هیچکام لە تایبەتمەندی و پێناسە سەرەکییەکانی کورتەفیلم کە پێناسەیەکی دیاری هەیە کە خاڵی جیاوازی ئەم جۆرە لە سینەمایەی لەگەڵ شێوازەکانی دیکەی سینەما رەچاو نەکردووە و تەنیا لەبەر ئەوەی کە ماوەکەی کورتە ناوی "کورتەفیلم"ی لەسەر دابنێین.

بۆ خۆی دەڵێ، ئەو خاڵ و فاکتۆرانەی کە پێویستە فیلمێکی کورت هەیبێ بریتین لە "کورتبێژی، داهێنان، بوێری لە داهێنانی ئایدیا و پەرژانە سەر بابەت، ئاشنایی سڕینەوە و ناسینی شەبەنگ و زەوقی بینەر و لە گشت گرینگتر نیگا و تێڕوانینی سەربەخۆ"یە بۆ کورتە فیلم وەک سینەمایەکی تایبەت کە مەیدانی نواندن و دەرخستنی ئەنگێزە و ئەزموونەکانی دەرهێنەرێکی بواری سینەمایە لە مەودای کورتدا.

سینەما لەلای تەوفیق ئەمانی، هونەری مۆدێرنە کە بەرپرسایەتییەک دەخاتە سەرشانی خولقێنەرەکەی، ئەو پێیوایە پرسی رەزامەندیی بینەر و بەردەنگ لە سینەما و بەتایبەت کورتەفیلم یەک لەو پرسە هەستیار و جیددییانەیە کە دەبێ گرنگیی پێبدرێت.

دیسان پێداگری دەکاتەوە کە سینەمای کورت سینەمایەکە کە سەروکاری لەگەڵ تەکنیکی هزر و تێفکریندا هەیە و چ باش دەبێ کە ئەم تەکنۆلۆژییە بخرێتە ئیختیاری زۆربەی خەڵک. رایەک هەیە دەڵێ "ئەگەر دەتەوێ بە وردی بڕۆیتە ناخی هەموو کێشە و برک و ئازارەکانی کۆمەڵگایەکەوە و جوانی و بەرهەمەکانی بناسیت، بڕۆ کورتە فیلمی دەرهێنەرانی ئەو کۆمەڵگایە ببینە".

### رۆژهەڵاتی کوردستان جەمسەری کورتە فیلمی ئێرانە!

رۆژهەڵاتی کوردستان وەک ناوچەیەکی جوغرافیایی کەلە چوار پارێزگای ئیلام، کرماشان، سنە و ورمێ پێکهاتووە، بەهۆی کۆمەڵێک تایبەتمەندیی هەرێمی، کۆمەڵایەتی، فەرهەنگی و ... لەمێژە کەڵکەڵە و جموجۆڵە فەرهەنگی، ئەدەبی و هونەرییەکان تێیدا گەشەیان کردووە و هەرکامەیان لە قۆناغ و زەمەنێکی

دیاریکراودا ڕەوت و جووڵانەوەیەکی فەرهەنگییان سازکردووە.

ناکرێ لەم ڕاپۆرتە کورتەدا بگەڕێینەوە بۆ سەرەتای سەرهەڵدانی شانۆ، وەک دایکی سینەما لە ڕۆژهەڵات، بەڵام ئەگەر بمانەوێ ئاماژەیەک بە بزاوت و حەرەکەتی بەناو "سینەمای کوردی" لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان بکەین، دەبێ کۆتایی دەیەی ۱۳۷۰ی هەتاوی (۱۹۹۱ زایینی) و سەرەتای دەیەی ۱۳۸۰ وەک قۆناغێکی گرنگ و بووژانەوەی دەست نیشان بکەین، چونکە لەم قۆناغەدا تێڕوانین و ڕوانگەی نوێ و سەردەمیانە بۆ سینەما لەدایکبووە و کامیرا، فلاش، کات، دیافراگم و ... و زۆر وشە و دەستەواژەی دیکە ڕۆژانە کەوتنە سەرزاری خەڵک و فیلمی کوردی بەرهەمهات. هەرچەند تایبەتمەندییە سەرەکییەکان و ئەو فاکتۆرانەی کە سینەمایەکی پرۆفیشناڵ پێویستییەتی هێشتا لە کوردستان بوونیان نییە و کۆمەڵگەیەکی سینەمایی ئەکتیڤ و ناسراو کە وەڵامدەری ویستی کۆمەڵگا بێت و بتوانێ لە ئاستی جیهانیدا قسەی بۆ کردن هەبێت، لە کوردستان نەهاتۆتە ئاراوە، بەڵام بوونی تاکی بە توانا و خاوەن فکر و ڕۆڵگێڕ بە تەواوەتی هەستی پێدەکرێ و بەتایبەتی لە بواری کورتە فیلمدا هونەرمەند و دەرهێنەرانی لاو بە گوڕ و تینی لەڕادەبەدەر هاتوونەتە مەیدان و لە بوارەکانی "سینەمای دیکیۆمێنت، چیرۆکی، ئەزموونی، ئەنیمەیشن و بەتایبەت کورتە فیلم"دا خۆیان دەرخستووە و هەر ساڵە لە ناوچە کوردنشینەکانی ئێران دەیان فێستیڤاڵ و کۆڕ و کۆبوونەوەی سینەمایی ڕێک دەخرێت کە بە هەوڵ و تێکۆشانی سینماکار و دەرهێنەرانی لاوی خوێندەواری کورد بەرهەمدێت.



بەشداریی بەربڵاو و بەردەوامی ئەم بەرهەمە سینەماییانە و مسۆگەر کردنی سەدان خەڵاتی ناوچەیی، ئێرانی و نێودەوڵەتی دەربڕی توانایی، زیندوویی و ئاستی بەرزی ئەم هونەرەیە لە ڕۆژهەڵات. کە بە ئیعترافی دەرهێنەر و سینەماکارانی ناوداری ئێرانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بەو تایبەتمەندییانەوە شانازیی "جەمسەری کورتە فیلمی" ئێرانی بە باڵا بڕاوە و شایستەی ئەم نازناوەیە.

ڕەخنەگرانی سینەما و چالاکانی فەرهەنگی لەو باوەڕەدان سەرهەڵدانی سینەمای کورتەفیلم لە ڕۆژهەڵات بە فۆرم و ئایدیای نوێوە دەربڕی گەشەی کۆمەڵایەتی، فەرهەنگی و هەروەها هەنگاونانە لە ڕاستای بەشداریی و تێکەڵبوون بە شارستانیەتی سەردەم کە سینەما یەکێک لە توخمە گرنگەکانییەتی.

"تەوفیق ئەمانی" هونەرمەندی دەرهێنەری لاو پەروەردە کراوی ئەم بارودۆخەیە و بەردەوامە لە کار و داهێنان کەلە حەفتەکانی ڕابردوودا بە بەشداریی نێودەوڵەتیی کورتەفیلمی "لێرە جادەکان بێ کۆتایین" توانی ٣٥مین خەڵاتی ئەو فیلمە بەدەست بهێنێ و لاپەڕەیەکی تر لە خەڵاتەکانی پڕ بکاتەوە.

ئەم سینەماکارە لاوە ڕۆژهەڵاتییە بە هەوڵ و تەقەلای هەتا ئێستا ئەم کورتە فیلمانەی بەرهەم هێناوە:

- کورتە فیلمی "گوڵی پاراو" کە خەڵاتی باشترین فیلمی چیرۆکیی "فێستیڤاڵی سەرانسەریی فیلمی گوڵی پاکدەشتی تاران"ی مسۆگەرکردووە.
- کورتەفیلمی "چریکەی نگریشی قاپێک" کە لە شەش فێستیڤاڵی ناوچەیی و ئێرانیدا سەرکەوتنی بەدەستهێناوە و خەڵاتکراوە.
- کورتەفیلمی "پانتایی گەرمی خەیاڵێک" کە خەڵاتی باشترین فیلمی "بابەتی ژن"ی فێستیڤاڵی تاقگەی ئێرانی مسۆگەرکردووە.
- کورتەفیلمی "لێرە جادەکان بێ کۆتایین" کە هەتا ئێستا توانیویە لە نزیک بە ٤٠ فێستیڤاڵی جۆراوجۆری سینەمایی لە ئاستی ناوچەیی، ئێران و نێودەوڵەتیدا بەشداریی بکات و سەرجەم ٣٥ خەڵاتی بەدەستهێناوە.
- کورتە فیلمی "هێما" کە خەڵاتی دوو فێستیڤاڵی لە ئاستی ئێراندا دەستەبەرکردووە.

**سەرچاوە:**

وێبلاگی خودی هونەرمەند.



# پاڵێوراوانی ئۆسکاری ٢٠١٣

و: ئازاد بەهین

فیلمی "لینکۆڵن" بە دەرهێنەری ستیڤن سپیلبێرگ پاڵێوراوبوون بە ١٢ بەش، لەوانە باشترین فیلم، باشترین کارئەکتەری رۆڵی یەکەمی پیاو و باشترین دەرهێنەر، لە پێشەوەی رێورەسمی ئۆسکاری ئەمساڵ دایە. "لایف ئۆف پای" بە پاڵێوراوبوون لە ١٢ بەشدا، لە پلەی دووهەم دایە.

زۆرێک لە رەخنەگران پێش راگەیاندنی ناوی پاڵێوراوانی ئۆسکار لە سەر ئەو باوەڕە بوون کە درامای "لینکۆڵن" بە دەرهێنەریی ستیڤن سپیلبێرگ لەم ساڵدا لە پێشەوەی هەمووان دەبێت. ئێستا بە راگەیاندنی فەرمی پاڵێوراوەکان لە لایەن "ئەکادیمی زانست و هونەرە سینەماییەکان" (ئۆسکار) لە رۆژی پێنج شەممە ١٠ی ژانویە، ئەم پێش گریمانەیە بوو بە راستی.

فیلمی "لینکۆڵن" مانگەکانی کۆتایی ژیانی ئابراهام لینکۆڵن، شانزەهەمین سەرۆک کۆماری ئەمریکا و هەوڵە چڕوپڕ و جیدییەکانی ئەو بۆ لابردنی

یاسای کۆیلەتی لە سەردەمی شەڕی ناوخۆیی ئەمریکا دەگێڕێتەوە. ئەو فیلمە یەکەمینجار ئۆکتۆبەری ٢٠١٢ لە فێستیڤاڵی فیلمی نیۆیۆرک نمایشکرا.

ستیڤن سپیلبێرگ تا ئێستا دووجار بە فیلمەکانی "Schindler's List" و "Saving Private Ryan" بووەتە براوەی ئۆسکار.

سپیلبێرگ لە فیلمی "لینکۆڵن"دا، دێنیل دی لوئیس، کارئەکتەری بەریتانی بۆ رۆڵی یەکەم بەکارهێناوە. ئەگەر رۆڵگێڕانی ئەم کارئەکتەرە ئەمجارەش بۆچوونی لیژنەی داوەرانی ئۆسکار بەرەو لای خۆی راکێشێت، ئەمە سێهەمین خەڵاتی ئۆسکاری ئەو دەبێ لە دوای فیلمەکانی "قاچی چەپی من" (١٩٩٠) و "خوێن دەڕژێت" (٢٠٠٨).

"لایف ئۆف پای" فیلمی سێ رەهەندی بە دەرهێنەریی ئەنگ لی بە پێی چیرۆکێکی هەر بەو ناوە لە نووسینی "یان مارتەر" درووست کراوە. ئەنگ لی ساڵی ٢٠٠٦ بۆ فیلمی "Brokeback Mountain" ئۆسکاری باشترین دەرهێنەریی وەرگرت.

پاڵێوراوانی وەرگرتنی خەڵاتی ئۆسکار لە بەشە گرینگەکاندا:

باشترین فیلم: لینکۆڵن، ئارگۆ، لایف ئۆف پای (life of pai)، خۆشەویستی، Les Misérables)،Silver Linings Playbook، Django Unchained، Beasts of the Southern Wild، سی خولەک دوای نیوەشەو.

باشترین دەرهێنەری: ستیڤن سپیلبێرگ (لینکۆڵن)، میشائیل هانکە (خۆشەویستی)، ئەنگ لی (لایف ئۆف پای)، بێن زایتلین (Beasts of the Southern Wild)، دەیڤید ئۆ راسێل (Silver Linings Playbook).

باشترین ئەکتەری رۆڵی یەکەمی پیاو: برادلیکۆپەر، دانیەڵدی لوئیس، دێنزڵواشنگتۆن، هیو جەکمەن، واکین فینیکس.

باشترین ئەکتەری رۆڵی یەکەمی ژن: جێسیکاچەستیەن، جێنیفەر لاورێنس، نائومی واتس، ئیمانوئێلریڤا و کوڤێن ژانەوالیس.

باشترین ئەکتەری رۆڵی تەواوکەری پیاو: ئالەن ئارکین (ئارگۆ)، رابێرت دی نیرو (Silver Linings Playbook)، فیلیپ سیمۆر هافمەن (مامۆستا)، تامی لی جۆنز (لینکۆڵن)، کریستۆف والتس (Django Unchained).

باشترین ئەکتەری رۆڵی تەواوکەری ژن: ئەمی ئادامز (مامۆستا)، سالی فیلْد (لینکۆڵن)، ئان هاتاوی (لێس میسێرابلس)، هۆلەن هانت (The Sessions)، جەکی ڤیور (Silver Linings Playbook)..

باشترین فیلمنامەی نووسین: خۆشەویستی (میشائیل هانەکە)، Django Unchained (کوئێنتین تارانتینۆ، فڕین (جان گیتینز، قەڵەمڕەوی دەرکەوتنی

مانگ) وەس ئەندەرسۆن و رۆمان کاپۆلا، سی خولەک دوای نیوەشەو (مارک بول).

باشترین فیلمنامەی وەرگیراو: ئارگۆ (کریس تریف)، Beasts of the Southern Wild (لوسی ئەلیبار و بەن زایتلین)، لایف ئۆف پای (دەیڤید مەگی، لینکۆڵن (تونی کاشنەر)، Silver Linings Playbook (دەیڤید ئۆ راسێل).

باشترین فیلمی نائینگلیزی زمان: خۆشەویستی (ئۆتریش)، کەن تیکی (نەرویج)، No (شیلی)، پەیوەندی خۆشەویستیی پاشایانە (دانمارک)، War Witch (کانادا).

چاوخشاندنێک بە رکابەرانی ناودار

لە فیلمی "سی خولەک دوای نیوەشەو" بە دەرهێنەریی کاترین بیگلو، روداوی ئۆپەراسیۆنی دۆزینەوە و کوشتنی ئوسامە بن لادن، رێبەری ئەلقاعیدە لە لایەن کۆماندۆکانی هێزی تایبەتی سوپای ئەمریکا وێنا کراوە و خراوەتەڕوو.

ئەو فیلمە لە لایەن رەخنەگرانەوە پێشوازی لێکرا، بەڵام بەهۆی هێنانە ئارای هەندێک پرسی سەربازیی، لە لایەن هەندێک لە سێناتۆرەکانی ئەمریکا و هەروەها رێکخراوی سی ئای ئەی رەخنەشی لێگیرا.

کاترین بیگلو ساڵی ۲۰۱۰ بۆ فیلمی (The Hurt Locker) ئۆسکاری باشترین دەرهێنەری پێ بەخشرا.

یەکێکی دیکە لەو فیلمانەی کە رەخنەگران شانسێکی باشی بۆ پێشبینی دەکەن بۆ وەرگرتنی ئۆسکار، فیلمی "ئارگۆ"ی بێن ئەفلەکە کە بۆخۆشی رۆڵی تیایدا دەگێڕێت.

فیلمی "ئارگۆ" چیرۆکی رزگارکردنی ٦ کەس لە کارمەندانی باڵوێزخانەی ئەمریکایە لە کاتی بە بارمتەگرتنی ئەو باڵوێزخانەیە لە تاران لە لایەن یەکێک لە مەئمورانی رێکخراوی سی ئای ئەی (بە رۆڵگێرانی بێن ئەفلەک) دەگێڕێتەوە.

فیلمی " Django Unchained" بە دەرهێنەریی کوێنتین تارانتینۆ یەکێک لەو فیلمانەیە کە شانسی زۆری بۆ وەرگرتنی خەڵاتی ئۆسکاری ئەمساڵ هەیە. جیمی فاکس، لیئۆناردۆ دی کاپریۆ و کریستۆف والتەس لە ئەکتەرەکانی ئەو فیلمەن. تارانتینۆ دوایین جار بە فیلمی (Inglourious Basterds) لە حەوت بەشدا ببووە پاڵێوراوی وەرگرتنی ئۆسکار لە ساڵی ۲۰۱۰دا.

بەڕێوەبەرانی ئۆسکار رایانگەیاندووە کە ئەمساڵ بە بۆنەی ۵۰ ساڵەی جەیمز باند، مەئمەوری ۰۰۷، رێزێکی تایبەتی لێدەگرن. لە دەیەکانی رابردوودا فیلمەکانی جەیمز باند چەند جار بۆ وەرگرتنی ئۆسکار پاڵێورابوون کە ئەو پاڵێوراوبوونانە

زیاتر لە بەشە تەکنیکی و تایبەتییەکاندا بووە.

دوایین فیلمی جەیمز باند بە ناوی "سکەی فالّ" بە رۆڵگێڕانی دانیەل کرەیگ لە رۆڵی مەئموری ۰۰۷ هەم لە لایەن لایەنگران و هەم لە لایەن رەخنەگرانییەوە، پێشوازییەکی بەرچاوی لێکرا.

هەشتا و پێنجەمین رێورەسمی ئۆسکاری ئەمساڵ رۆژی ٢٤ی فوریە بەرێوە دەچێت. بەرێوەبردنی ئەم رێورەسمە لە ئەستۆی راسێت مەک فارلین، کۆمێدینی ئەمریکاییە.



**سەرچاوە: سایتی دویچە**

http://www.dw.de

# وێنەی ژنی ئێرانی لە فیلمی فارسیدا



و. لە فارسییەوە: جەواد حەیدەری

فیلمی فارسی چۆن وێنەی ژنی ئێرانی نیشانداوە، ئایا وێنەی ژنی ئێرانی چ ژنی مۆدێرن و چ نامۆدێرن بە دروستی و راستی لە فیلمی فارسی وەک خۆی پیشاندراوە؟

لە سەرەتای سەدەی بیستەم، رۆڵی تابۆشکێنی سینەما لە ناو کۆمەڵگای مەزهەبی و نەریتی ئێران زۆر و بەرچاو بوو، چونکە لە کۆمەڵگایەک کە مەزهەب دانی بە ئامادەبوونی ژن لە سەر سەکۆی شانۆ و ئاواز و گۆرانیدا

نەدەنا، سینەما زەمینەی بۆ ئامادەبوونی ژنان لەوبارەیەوە فەراهەمکرد. مۆدێرن خوازی حکومەت لەگەڵ دژایەتیکردنی چین و توێژی نەریتی و مەزهەبی کۆمەڵگا رووبەڕوو ببۆوە، ململانەی نێوان نەریت و مۆدێرنیتە و ئازادی ژنان وەک گرنگترین کێشە و گرفتی کۆمەڵگای ئێران کە ئێستاشی لەگەڵدا بێت پێی نایە ناو سینەمای ئێرانیشەوە.

فیلمی حاجی ئاغای ئەکتوری سینەما کە لە دەرهێنانی ئاوانس ئۆگانیانس بوو لە ساڵی (١٩٣١)دا وەک جدی ترین فیلمی ئێران داوا لە بینەرو تەماشاچی نەریتی و مەزهەبی ئێرانی دەکات کە بوونی ژن لە سینەما قبوڵ بکەن، پاڵەوانی فیلم کە " حاجی ئاغایە کابرای وشکی مەزهەبییە کە دژی ئەوەیە کە کچەکەی ئامادە بێت لە سینەمادا، لە کۆتایی فیلمەکەدا حاجی لەگەڵ سینەما ئاشتدەبێتەوە نە تەنها رازی دەبێت کە کچەکەی و زاواکەی رۆڵ بگێڕن بەڵکو خۆشی دەبێت بە ئەکتەر و رۆڵ دەگێڕێت.

سەرەڕای هەموو ئەمانە هێشتا کۆمەڵگای نەریتی رازی نییە لەوەی کە ژنان لە بواری سینەمادا بوونی هەبێت و لەبەرامبەر ئەو ئامادەبوونەی ژنان بەربەرەکانی و دژایەتی دەکات و رێگری دەکات.

خاتوو "رۆح ئەنگیزی سامی نەژاد" لەبەر ئەوەی کە لە فیلمی " کچی لوڕ" لە ساڵی (١٩٣٣)ڕۆڵی گێڕا بوو چەندین ساڵ کەوتە بەر شاڵاوی سووکایەتی پێکردن و لە لایەن خزم و کەسانی دەورووبەری سەرکۆنە و سەرزەنشت کرا.

هەروەک دەبینین سینەمای ئێران هەر لەسەرەتای دەستپێکردنەوە لە گەڵ رەوتی کۆمەڵگا بەرەو مۆدێرنیتە و نوێبوونەوە هەماهەنگە، بەڵام دواتر دەرهێنەران و بەرهەمهێنەرانی فیلمی فارسی بە نیگایەکی کۆنەپەرستانە و هاوکات هاودەنگبوون لەگەڵ چینی نەریتی و کۆنەخواز بەرەنگاری رەوتی نوێخوازی و مۆدێرن بووە و دەستیان بە سووکایەتیکردن بە بەهاکانی مۆدێرن کرد.

روانین و دیدی سینەمای فارسی بۆ ژن لەسەر بنەمای "دووالیزم " یان "دووانەیی"یە.

ژن لە سینەمای فارسییدا یان فریشتەیە یان شەیتان، فیلمی فارسی ژنی کردووە بە دوو بەش یان دوو دەستە، دەستەی خێر و دەستەی شەڕ، بێ گوناح یان گوناحکار. ژنی فریشتەئاسا لە ناو فیلمی فارسیدا بەو ژنە دەوترێت کە دایکێکی میهرەبان و لەخۆبردوو بێت یان هاوسەرێکی داوێنپاک بێت. ژنی

باش لە فیلمی فارسیدا، ژنێکە کە لە نەبوونی مێردەکەیدا دەبێتە پیاوی ماڵەوە و منداڵەکانی بە هەزار زەحمەت و کوێرەوەری دەخاتە ژێر باڵی خۆی و بەخێویان دەکات و گەورەیان دەکات، بەڵام ژنی خراپ یان شەیتان ئاسا بەو ژنە دەوترێت کە ژنێکی مۆدێرن و سەر بە چینی باڵایە و خۆشگوزەرانە کە بە ناز و مەکر و لەنجە و لاری خۆی دڵی پیاوانی سادە و ساکار و ساویلکە لە خشتە دەبات.

لە فیلمە کۆنەکانی فارسیدا ژن بەو دەستە دابەشدەکرێت، دەستەی شار و دەستەی لادێ، کچانی گەنج و لەباری لادێی هەتا ئەو کاتەی لە گوند و لادێ دادەنیشن کچێکی شەرمن و شەرمێون و بەئەدەب و بەحەیان، بەڵام کاتێک پێ دەنێنە شار و ماڵیان بۆ شار بار دەکات لە هەڵسوکەوت و مامەڵەکردن لە گەڵ پیاوان و ژنانی نالەبار و نەفس نزمی شار هەڵسوکەوتی ئەوانیش گۆڕانی بەسەردادێت و بەرەو گەندەڵی و بێ رەوشتی پەلکێش دەکرێن.

ئەمە تەنها فیلمی فارسی نەبوو کە ژنانی مۆدێرن و نوێخوازی شاری بە سیمبول و سەرچاوەی گەندەڵی و بێرەوشتی وەسف دەکرد، بەڵکو لە ناو ئەدەبیاتی داستانی و چیرۆکەکانی ئەو سەردەمیش بە تایبەتی لە ناو نووسینەکانی محەمەد حەجازی و محەمەد مەسعود ژن بە هۆکار و سەرچاوی بێ رەوشتی و گەندەڵی و بێئەخلاقی لە شارەکان لە قەڵەم دەدران و لە کۆمەڵگا دوور دەخرانەوە.

لە ساڵانی پەنجاکان و شەستەکان سەرەڕای ئەوەی کە ژنان لە ناو کۆمەڵگادا حوزورێکی چالاکیان هەبوو و ئازادی و سەربەستی ژنان ببووە دروشمی حکومەت، بەڵام ئەو دروشم و ئازادی و چالاکی ژنان لە لایەن چینی مەزهەبیەوە جێی رەزامەندی نەبوو و دژایەتی دەکرا. کۆمەڵگای نەریتی زۆر بە توندی دژی ئەوەیە کە ژنان لەناو بوارەکانی کۆمەڵگادا حوزورێکی چالاک و ئەکتیڤی هەبێت و هەڵسوکەوتی ژنان لە کوچە و کۆڵان و شەقامەکان بە بێ ئەخلاقی لەقەڵەمدەدرا. هەر بۆیە لەو سەردەمەدا فیلمی فارسی لەبارەی سکس و خۆ رووتکردنەوەی ژنان بە شێوەیەکی موحافزەکارانە هەڵسوکەوتی دەکرد.

گۆرانی وتنی ژنان لەو ناو فیلمە فارسییەکانی ئەو سەردەمە بە تایبەتی لەناو کافتریا و بارەکان (ئەو فلیمانەی کە دڵکەش و پووران گۆرانییان تێدا وتووە) زیاتر بە شێوەی زۆرملی و لە رووی ناچارییەوە بوو. دڵکەشی گۆرانیبێژ لە فیلمی " شەرمەزار" کە رۆڵی ژنێکی بەدڵ و جورئەت و ئازا و زیرەک و لیهاتوو دەبینێت، بەڵام هاوکات ژنێکە کە فریودراوە و کڵاویان لەسەر ناوەوە و ئەویش

ناچارە بۆ ئەوەی بتوانێت بژێوی ژیانی خۆی دابین بکات لەناو کافتریاکانی شاردا دەستدەکات بە گۆرانی وتن. ئەو بە بێ ئەوەی پێویستی بە پیاو هەبێت لە سەر پێی خۆی رادەوستێت و لە کۆتایی فیلمەکەش لەگەڵ دەستگیرانەکەی شاری بەجێدەهێڵێت و بۆ باوەش و ئامێزی سەوزی لادێ دەگەڕێتەوە. هەرلەبەر ئەوەیە کە تەماشاچی و بینەر لەبەر پاکی و بێگەردی و بەری بوون لە تاوانەکانی ئەو ژنە خۆش دەبێت.

لە لایەکی ترەوە لە فیلمەکانی ئەو سەردەمەدا خێزان خاوەنی پێگە و جێگەیەکی گرنگە و پاراستنی هەرێمی خێزان بۆ دەرهێنەران و بەرهەمهێنەران زۆر گرنگە. لەو فیلمانەدا کەمتر باس لە خیانەتی هاوسەری و پەیوەندییە نامشرووعەکانی ژن و پیاو دەکرێت و ژنانی لەشفرۆش کەمتەر لەو فیلمانەدا دەردەکەون.

ژنان لەو فیلمانەدا زیاتر ژنێکی نەریتی و کۆنەخوازن هەتا ژنێکی مۆدێرن، ژنانێکن کە زیاتر رۆڵی دایکێکی دڵسۆز و میهرەبان و دڵۆڤان و هاوسەرێکی فیداکار و بەئەمەگ دەبینن، ئەوان تەنانەت جگەرەش ناکێشن و مەشروب و ئارەق ناخۆنەوە. ژنی مێردداری نەریتخواز و کۆنەخواز ئەگەر فریوی ژیانی مۆدێرن بخوات زۆر بەلارێدا دەبرێت و لە زۆربەی فیلمەکان ئەو جۆرە ژنانە سەرشۆڕدەبن و پەشیمان دەبنەوە یان لە کۆتاییدا بە سزای کردەوەکانی خۆیان دەگەن.

لە فیلمی "شەوانی تاران" کە لە ساڵی ١٩٥٢ لە لایەن سیامەک یاسەمی بەرهەمهێنراوە، مەهین کە ناوی پاڵەوانی فیلمەکەیە کە خیانەت لە مێردەکەی دەکات و نوقمی بێڕەوشتی دەبێت، هەرچەند مێردەکەی داوای لێدەکاتەوە کە بگەڕێتەوە بۆ سەر ژیانی هاوسەرێتی، بەڵام بە هۆی ئازاری ویژدانەوە سەرئەنجام خۆی دەکوژێت.

(حەمید نەفیسی وێنەی ژنان لە فیلمە فارسییەکانی دەیەی ١٩٥٠ زانیینی لە ئێران بەمشێوەیە وێنا دەکات. پەیوەندی نێوان ئەندامانی خێزان لە ناو فیلمەکانی ئەو کاتدا زۆر ئاڵۆزە و پەیوەندی نێوان دایک و کوڕ زۆر بەهێزە و وەک پەیوەندی "ئۆدیب" وایە . کوڕ ملکەچی باوکە بەڵام هاوکات پەیوەندییەکی زۆرگەرمی لەگەڵ دایکی هەیە و کێبەرکێیەک لەسەر سۆزی دایک لە ئارادایە. لە خێزاندا دەسەڵات بە دەست باوکەوەیە و باوک قسەی یەکەم و ئەخیر هەر ئەو دەیکات. ژن دەبێت بێگەرد و پاک و فیداکار و بەخشندە و دڵۆڤان و لەخۆبردوو بێت و ببنەهۆی پتەوتربوونی پەیوەندی ئەندامانی خێزان و چاوپۆشی لە هەموو جۆرە لاسارییی



و ملهوڕی مێرد بکەن. ژنانێک هەن کە مێردەکانیان و کوڕەکانیان فریو دەدەن و لە دەرەوەی ماڵەوە هەرچی پێیانخۆش بێت دەیکەن و هەر ئەوەش یەکێتی و یەکریزی ئەندامی خێزان دەخەنە مەترسییەوە. ئەو جۆرە ژنانە و ئەو کەسانەی کە بە دەست ئەو ژنانەشەوە فریو دەدرێن و دەکەونە داویانەوە هەموویان سزا دەدرێن و لە کۆتاییدا خێزانەکان بە ناچاری چاوپۆشی لە تاوانباران و گوناهباران دەکەن و دەرفەتی گەڕانەوەیان پێدەدەن. حەمید نەفیسی وەرزنامەی فارابی ژمارە ٣٤).

لە فیلمی سینەمایی دەیەی ١٩٥٠ ئێران کێشەیەکی قوڵ لە نێوان نەریت و مۆدێرنیتە لە ئارادابوو، کۆمەڵگا تەنها لە چارچێوەی هاوسەرێتی یان دایکێکی وەفادار و بە ئەمەک ژنی قبوڵ بوو و لە دەرەوەی ئەو چوارچێوەیە ژنی بە بێ رەوشت و گەندەڵ لە قەڵەمدەدا و بە شایستەی سزای دەزانی.

بەهەرحاڵ لەو سەردەمەدا کۆمەڵگا و سینەماش هێشتا ئامادەیی ئەوەی تێدانەبوو کە بە بێ ترس گەندەڵی ژنان بخاتەڕوو، دەبوایە زیاتر ١٠ ساڵ تێپەڕی بوایە هەتا فیلمسازێکی ئەو سەردەمە بتوانێت ژنێکی سەرسەری و گوێنەدەر بە شێوەیەک لە شێوەکان وەک سەماکەرێک بێنێتە سەر شانۆ کە بە شێوەیەکی نیوەڕووت لە کافتریاکان سەما بکەن و جەستەی نیوەڕووتی خۆیان دەرخەن یان لەگەڵ پیاوێکی گەمژە بچێتە ژووی نووستن. لە کۆتایی فیلمەکانی ئەو سەردەمەدا ژنەکە لە گەڵ پیاوێکی گەمژە و گێل دەچنە زیارەتی شوێنە پیرۆزەکان و لەوێ تۆبە دەکەن و پیاوەکە ئاو بە سەری ژنەکەدا وەک ئەوەی کە تۆبەی کردووە و پاک بۆتەوە.

ئەوە تەنها سەماکەران و لەشفرۆشەکان نەبوون کە شوناسی ئەوان لە کۆتایی فیلمەکاندا گۆڕانی بەسەردادەهات و بە شێوەیەک کە لە هەندێک لە فیلمەکانی وەک "گەنجی قارون " و فیلمەکانی سامۆئیل خاچکیان جگە لە گۆڕانی دەروونی ژنان رووخسار و سیمای دەرەوەی ئەوانیش گۆڕانی بەسەرداهاتووە و گۆڕانکارییەکان دەبیندرێت.

لە گەنجی قارون دا شیرن کە پاڵەوانی فیلمەکەیە لە گەڵ پیاوێکی غەریبە دادەنیشێت و مەشرووب دەخواتەوە و بە جلێکی تەسک و تەنک کە هەموو جەستەی تێدا دەبیندرێت لە ئاهەنگ و مەراسیمەکانی شەوانەدا بەشداریی دەکات و لەناو حەوزدا مەلێ دەکات، بەڵام لە کۆتاییدا شەودا لەچک دەکات و جلەکانی دەگۆڕێت وبێخەم دەگەڕێتەوە بۆ ماڵی عەلی.

فیلمەکانی فارسی لە دەیەی ١٩٦٠ بەرەو نمایشکردنی سێکس دەڕۆن و وردە وردە ئەکتەرەکانی سێکسی لە سینەمای ئێران دەردەکەون و لە لایەن تەماشاچییەکانەوە گرنگی تایبەتی پێدەدرێت. ئەو جۆرە لە فیلمەکان هەم لەلایەن خەڵکەوە پێشوازی لێدەکرێت و هەم لە گەڵ سیاسەتەکانی حکومەت یەکدەگرنەوە.

حەمید نەفیسی لەبارەیەوە دەڵێ: خێرابوونی مۆدێرن بوون و بە رۆژئاوایی کردنی ئێران و بەرهەمهێنانی ئاواز و هاوردەکردنی فیلمی رووت و نمایشکردنی فیلمە رووتەکان بە شێوەیەکی بەربڵاو پەرەدەستێنێت، رۆژنامەی کەیهان لە ساڵی ١٩٧٨ لە راپۆرتێکدا راگەیاند: زۆربەی ئەو فیلمە رووتانەی کە لە سینەماکانی تاران نمایشدەکرێن فیلمی ئەمریکی و ئیتالیایین و لە کۆی ١٢٠ سینەمای لە تاران ٦٧ سینەمای تاران فیلمی رووت نمایش دەکەن.

لە فیلمەکانی دەیەی ١٩٧٠ بە گشتی ژن شوناسێکی ناشیرین و شێوێندراوی هەیە، لە فیلمەکانی ئەو سەردەمە دا باس لە ژنانە ناکرێت کە مامۆستان یان کرێکارن یان خوێندکارن یان پزیشکن یان فەرمانبەرن، فیلمەکان پڕن لە چیرۆک و داستانی سێکسی و سەما و فیلمەکان پڕن لە ژنانی سەماکەر و لەشفرۆش کە کۆمەڵگا دەریکردوون و هیچ داموودەزگایەکی حکومی پشتیوانی و بەرگرییان لێناکات. هەربۆیە سەماکردن و گۆرانی وتن دەبێتە پیشەی سەرەکی ژنان لە فیلمە فارسییەکانی ئەو سەردەمە. بە پێچەوانە دڵکەش لە فیلمی " شەرمەزار" گۆرانیبێژێکی سەربەخۆیە کە توانیویەتی کەسایەتی خۆی بپارێزێت و بە بێ پشتبەستن بە پیاوانی سووک و نەفس نزم دەتوانێت بەرەی خۆی لە قوڕ دەربێنێت. بوونی ژنانی گۆرانیبێژ و سەماکەر بە دەیەی ١٩٧٠ لە فیلمە فارسییەکاندا پشتدەبەستن بە پیاوانی گەمژە و سەرسەری کە لە پێناو سێکسدا بەرگری و پشتیوانییان لێدەکەن.

ژنی لەشفرۆش لە فیلمی فارسیدا کە بە هۆی پیشەکەیەوە کە لەشفرۆشتنە لە خانەکانی لەشفرۆشیدا هیچ سەربەخۆ نین و لە گرەوی پشتیوانی ئەو کەسانەدان کە خاوەنی باڕ و لەشفرۆشخانە و خانەکانی لەشفرۆشیی بوون. لەشفرۆشەکان بۆیان نەبوو کە بۆ خۆیان ژیانێکی ئاسودەی هاوسەرێتی پێکبهێنن یان عاشق و هۆگری کوڕێک یان پیاوێک بن، لە فیلمەکانی "پەری جوانە، شکست نەخواردوو، وەستا کەریم نۆکەرتم" کێشەکانی نێوان لەشفرۆشەکان و خاوەنی باڕ و خانەکانی لەشفرۆشی دەبیندرێت کە چۆن ئەو پیاوانە ژنان بۆ مەبەستەکانی



خۆیان چ لەباری ماددی و چ لەباری سێکسەوە دەچەوسێنەوە.

لە فیلمی جوامێر کە مەهدی ژورک لە ساڵی ١٩٧٤ بەرهەمی هێناوە زۆر بە ئاشکرایی ئەو کێشە دەخاتەڕوو کاتێک کە کچێک بە ناوی ئاسییە پاش مردنی باوکی دێتە تاران لە خانە لەشفرۆشەکاندا دەستدەکات بە سەما و گۆرانی وتن، کەچی دواتر خاوەنی خانەکانی لەشفرۆشتن ڕێگری دەکات لەوەی کە ئاسییە واز لە کارەکەی بهێنێت و ناهێڵێت و داوا لە ئاسییە دەکات کە لەسەر سەما و گۆرانی وتن بەردەوام بێت.

ژن لە فیلمە فارسییەکانی ئەو سەردەمە زۆربەی جار کچێکی بەدبەخت و چارەڕەشە کە توانای بەرگریی و پاراستنی لە شەرەف و نامووسی خۆی نییە و بە ئاسانی دەبێتە قوربانی پیاوانی مێباز و داوێنپیس، کە دواتر پیاوێکی گەمژە و هیچ نەزان دەبێتە پاڵەوانی فیلمەکە و بە چەقۆیەکی گەورە و دوگمەدار تۆڵە لە دەستدرێژکەران دەکاتەوە و بەرگریی لە حەیاچوونی خۆی دەکات. تەوری سەرەکی فیلمەکانی ئەو سەردەمە زیاتر باسی لەشفرۆشی و تێکچوونی شیرازەی خێزان بە هۆی بوونی ژنانی لەشفرۆشەوە دەکات. ژنانی لەشفرۆش لە فیلمە فارسییەکاندا بە پشتبەستن بە جوانی خۆیانەوە بە هەزار ناز و عیشوە و مەکر دڵی پیاوانی ساویلکە و گەمژە بە دەستدەهێنن و دەیانخە داوی خۆیانەوە و لە خشتەیان دەبن و شیرازەی خێزانی ئەو جۆرە پیاوانە تێکدەدەن.

لە فیلمی "سەماکەری شار" کە شاپوور قەریب دروستی کردووە، فروزان کە کچێکی سەماکەرە پیاوێک لە خشتە دەبات کە ئەو پیاوە زۆر لە ژیانی ڕۆژانەی خۆی وەزاڵە هاتووە یان لە فیلمی "پشت و خەنجەر" کە دەرهێنەرەکەی ئیرج قادرییە، پیاوێک بۆ ئەوەی کوڕەکەی لە دەست ژنێکی لەشفرۆش بە ناوی پەری ڕزگار بکات لەگەڵ کوڕەکەی دەچێت بۆ لای لەشفرۆشەکە بۆ ئەوەی واز لە کوڕەکەی بهێنێت، بەڵام کە چاوی بە پەری دەکەوێت ئاشقی دەبێت و هەر ئەوەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە پیاوەکە واز لە خێزان و ماڵ و منداڵی خۆی بهێنێت و دواتر بکەوێتە داوی ماددە هۆشبەرەکانەوە، هەرچەند لە کۆتایی فیلمەکەدا پیاوەکە پەشیماندەبێتەوە و دەگەڕێتەوە بۆ لای ماڵ و منداڵی خۆی.

لە فیلمەکانی ئەو سەردەمەدا یانی دەیەی ١٩٧٠ ژنان زۆربەیان لە چینی هەژار و خوارەوەی کۆمەڵگان کە بۆ بژیوی ژیانیان دەچنە باڕ و نادی و خانەکانی لەشفرۆشی و دەستدەکەن بە گۆرانیوتن و سەماکردن و هەتا ئەو کاتەی کە لەسەر ئەو پیشەیە بەردەوام بن مافی ئەوەیان نییە بگەڕێنەوە بۆ ناو

باوەشی بنەماڵەکەیان و دەرهێنەرانی فیلمەکانیش ئەو جۆرە ژنانەیان تەنها بۆ سەماکردن و گۆرانی پێوتن و چێژوەرگرتنی سێکسی دەوێت و ئەگەر ژنێک بیهەوێت عاشقی دەرهێنەرێک یان بەرهەمهێنەرێک بێت دەبێت دەستبەجێ لە سەماکردن و گۆرانی وتن دوور بکەوێتەوە و تۆبە بکات و نەچێتەوە سەر ئەو ئیشە و ئاوی پاکی تۆبە بە خۆی دا بکات و لێرەشدا دەهێنەرەکان کە خۆیان لە تاوانەکانی ئەو ژنانە بەشدارن زۆرجار خۆیان وەک رزگارێک نیشان دەدەن کە دەیانەوێت بەشێوەیەک لە شێوەکان ئەو ژنانە رزگاربکەن لە کاتێک خۆیان هۆکاربوون بۆ ئەوەی ژنان روو لەو ئیشوکارانە بکەن.

**سەرچاوە:**

سایتی رادیو زمانە.

